# ریگەی راستی ژین بۆ دنیاوو دین

دانەر

شیخ عمر شیخ طه البالیسانی

لە ژیر سەر پەرشتیو وپیش کەش کردنی محمد بالیسانی امامو خطیب لە مزگەوتی حسن البارح لە بەغدا لە چاپ دراوە .

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب (كوردى ,عربي ,فارسي)

١٣٩٨ ك . ١٩٧٨ ز .

مطبعة شفيق ـ بغداد

# رێگەی راستی ژین
# بۆ دنیاوو دین


دانـەر

شیخ عمر شیخ طه البالیسانی


لە ژیر سەر پەرشتیو وپیش کەش کـردنی محمد
بالیسانی امامو خطیب لە مزگەوتی حسن البارح لە بەغدا
لە چاب دراوە ·


١٣٩٨ك · ١٩٧٨ز ·

مطبعة شفيق ـ بغـداد

# « پێشەکی »

بە ناوی خودای بێ هەمتاو سوپا سیکی زورو بێ پایان بۆ ئەو کەسەی کە هەر ئەوە شایانی سوپاس کە پەروەر دیگاری عالەم دانەری بونو هەموو بونەوەریکە •

درودی زورو پیتی پەو برزیتە سەر خوشەویستی خوداو پەرداری ئادەمیزاد محمد المصطفی وە بە سەر کەسو کاری وەهەر کەس کە لە سەر ریگەو پرۆگرامی وان ئەمزیت تارۆژی دواو زیندو بوونەوەی گشتی •

لە دوای ئەمە ، لەو کاتەی خودای مەزن ویستی ئادەمیزاد دروست بکات ، زانیستو زانیاری دانا کە ببیتە دروشمی ئادەمیزاد وە هۆی پەرزی‌و نزمی دروستکردووەکانی جا بۆیە ئەبینین خودا فەرمانی دا بە فریشتەکان کە کرنوشی ریزو مل کەچی ودان هینان بە بەرێز تری‌و زلتری ئادەم ببەن چونکە چەند شتێکی پرسیار لێ کرون نەیان تواني وە نەیانزانی وەلام بدەنەوە •

کەچی حەزرەتی ئادەم بە گورجی زاني وە وەلامی دایەوە •

هەر وەك قورئانی پیرۆز ئەم باسەمان بۆ ئەگێریتەوە وە ئەفەرمویت « وعلم ادم الاسماء كلها ثم عرضهم على الملائكة فقال انبؤني باسماء هؤلاء ان كنتم صادقين قالوا سبحانك لاعلم لنا الا ماعلمتنا أنك انت العليم الحكيم قال ياآدم أنبئهم باسمائهم فلما أنبأهم باسمائهم قال ألم أقل لكم أني اعلم غيب السموات والارض واعلم ما تبدون وما كنتم تكتمون واذ قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا الا أبليس أبى واستكبر وكان من الكافرين » واتە خودا کە حەزرەتی ئادەمی

دروست کرد هەر شتێکی کـە هەیە بە حەزرەتی ئادەمـی زاناند کە بـۆ چی دەست ئەداو چۆن بە کاردێ وە چۆن سـودی لێ وەر ئەگیرێت وە ئادەمـی زادی وا دروسـت کرد کە بتـوانی بە هـۆی نیش‌و پیشـە سودو کەلك لەو شتانەی کە خـوای مـەزن لـەزەوی پەیدا کـردوونە دەست بخات وە بە هۆی لێ کولینەوە وە شت دوزینەوە وە لیکدانـی ئەم لە ئەو یا تیکەل کـردنی چارەسـەری زۆر پیویستی ژیـان بکات وەرۆژ بەرۆژ بەهۆی پیشەو بیر کـردنەوە شـتی وا دەر بخـات کـە مرۆ لێی سەرسام بێتو دان بە هیزی خـودا دابینی کـە ئەو هێزدارەی پەیدا کردیە وەئـەو توانایـەی پی بەخشیـوە وەکـردوویە شـایان کـە بکریتە گەورەی زەوی وە زەوی ئاوەدان بکات وە پیتو فـەری لێ دەر بخات ، کە چی فریشتەکان ئەو توانایەیان نەبو کە پسیاری هەلگیرو هەلسوراندنی کاری زەمینیان لی کرا ووتیان خوایە پاکی بۆ تۆیە ئیمە ئەوەی تۆ فیرت نە کرد بـین نازانین وە خۆت زانایو بێ حکیمەت نیە کە ئەو بەهرەت دایتە حەزرەتی ئادەم وە نەت داوە پێمە •

جا خوای مەزن فەرموی ئەی مـن پیم نـە وەتن کـە ئەوەی مـن دروستی ئەکەم وە ئەینیرمە زەوی بۆ زەوی ئـاوەدان کـردن لـە ئیوە شایان ترە وە مـن شتی پەنهانـو بزری هەمو ئاسمانو زەوی ئەزانم وە ئاگادارم بەهەرچی ئا شکرای ئەکەن وە یا پەنهانی ئەکەن •

وە لە بەر ئەوە فەرمانمان دا بە فریشتەکان کە کرنوش ببەن بـۆ حەزرەتی ئادەم وە دانی بەمە دابنین کە حەزرەتی ئادەم بە هۆی زانین لەوان زلترو بەریز ترە جا هەمـوو کرنۆشیان برد جـگە لە شـەیتان کرنۆشی نەبرد وە لوت بەرزی کـرد جا بۆیـە بە گاور دانـرا وە لە بارەگای خودای مەزن دەر کرا •

جا لەم ئایەتە پیروزانەدا بۆمان دەر ئەکەویت کە هەر کەس ریزی زانست وزانیارو زانیاری ئەگریت جیگەی لە بارەگـای خـودا نامینی هەروەك دەرکەوت کە بەنرخیو ریزی هەرکەسیك لە خزمەت خودا بـە پێ ی زۆریو کەمی زانستو زانیاریە •

هەر وەها لە روی ژیانی دونیاشدا هەر گەلیك زانیاری لە ناو بلاو بێتەوە لە ناو گەلان دەر ئەکەویت وە بەرزو بەرێز ئەبیت وپلەی ژیانی بلنـدو بالا ئەبیت ، کە چی ئەو گەنەی کەم زانە وە دوورە لە زانیاری روژبەروژ نزم ئەبیتو ئەکەویتە ژێر دەستو جەپۆکیبیگانە وە ژیانی تفتو تاڵ وبێ سوود ئەبیت بۆیە زانایان ووتوویانە ( بالعلم نسود وبالجهل نموت ) •

واتە بەزانیاری گـەورەئەبین وە بە نەزانین ئەمرین ، وە لەهـەمو مردنیك تاڵ تر مردنی ژیر دەستیو بێ دەستەلاتیە •

ئینجا ریگەو هۆی هەرگەلیك کە بیەویت بە پلەی بەرزی ژیان بکات ئەوەیە رولەزانستو زانیاری بکات وە پیویستی سەر شانیهەمو دانا بیکە کە هەموو توانایەکـی بۆ بـلاو کـردنەوەی زانیـاری پـەخش بـکات هەر زانایە بەپیی بابەتی خۆی ئەگەرنا تووشی سزای خووا ئەبیت بۆیە پیغەمبەری گەورە دروودیخودای لە سەر بێ بێ فەرموویەتی ( مـن آتـاه الله علما فکتمه الجمه الله بلجام من النار ) واتە هـەر کەسی خـوا زانینیکی پێ بەخشي وە لە خەلکی شاردەوە وە پێیانی را نە گەیاند خـواي مـەزن رۆژی سزا لغاوێکی ئاگری لە دەم ئـەکـات جا بۆیـە ئەبینین هـەموو

گەلیك بۆ بلاو کردنەوەي زانیاری هەولي داوە • وە گـەلی کـوردیش کە یەکیکە لەو گەلانەی کە زۆر پیویستیان بە زانیاری هەیە تا ئیستازاناکانی بۆ بلاو کردنـەوەی زانیـاری دریغیان نـە کـردووە وەلەبـەر ئـەوەی

که مرۆ بەزوبانی خۆی باشترو زووتر لە شت ئەگات وە ئەگەر بە زوبانی خۆي نەبیت ماوەیەکي ئەویت تاکو زوبانەکە فیر نەبیت ئەوجا ناوەرۆکە کە فیر ئەبیت وە بەم هۆیە بێ گومان تێ گەیشتنو فیر بوونی دووا ئەکەوێت وە کەمتر ئەبیت جا بۆیە پیویستە هەر کەلیك بە زوبانی خوی فیری زانیاری بکریت هەر بویەش خووا ئەفەرموویت (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ) واتە هیچ پیغەمبەریکمان نە ناردووە کە زوبانی گەلەکەی بەکار نەینیت بۆ راگەیاندن وەئەم ئەرکە لە کۆنەوە لە للو گەلي کوردا هەر ماموستاکانی ئاینی ئەستویانەتە ئەستوی خۆیان وە هەر ئەو بووینە کە ئالای زانستیان هەلگرتبی لە کوردوشان وە هەر کتیبکی بە دەرسیان بووتباوە کتیبەکە بە هەر زوبانیك بایە بە کوردي

بو قوتابیەکان واتەیان ئەکرد جا بەم جۆرە شەرح کردنە قوتابیەکان هەم فیری زوبانە کە ئەبوون هەم فیري بابەتەکە ئەبوون جا بەم جۆرە زانایان میکمل بە هەموو بابەتیکی زانیاری ئەبوون لەناوروولەکانی کوردیان بە کوردی بلاو ئەکردەوە وە لەم رووەوە هیچ کەموو کورتیان نەنوواند ئەگەر کەموو کورتیەکیان بوو بیت لەم رووەوە بوو کە نامەو پەرتوکیان کەمتر بە زوبانی کوردي نوسیوە ئەوەش وا نەبێ لە بەر نە زانی یاکەم دلسوزیان بیت بەلکە لە بەر چەند هۆیەك بووە کە لەم پیشکەش کردنە نازمرین بەلام ئەتوانم بلیم کرنگ تریان ئەمە بو کە نوسین بە کوردی هان و بلو نە ئەدرا وە بەلکو رێی لێ ئەگیرا وە بەر گری ئەکرا .

بەلام ئیستا کە میری هەستی بەمە کرد کە گەلی کورد لەم بابەتە زولمي لێ کراوە وە هەنگاویکی پیرۆزی رانا بۆ لا بردنی ئەم زولمە وە ترایکەي نوسینو خویندني کوردی کردەوە وە باوي بە زوبانی کوردی داو نوسەرە کوردەکانی هانداو ریگای دان کە بە زووبانی کوردی

بنوسن هەر کەس لەو بابەتەی کە ئەیزانی دەستی پێ کـرد وە نامەو پەرتوکیان نوسین وە نامە خانەی کوردی دامەزراو رۆن و ئاوەدان کرا وە ماموستایەکانی ئاینیش کە لە هەمـوو کاتیکدا لە هـەموو هەنگاوێک هەر پیش کەوتو بووینە وە هەموو کەس ئەزانی کـه لە بەر ئـەوان نەبوایە هیچ زانینیك لە کوردســتان بـلاو نە ئەبوەوە وە هیـچ کەس هیچی نە دەزانی وە لە هیچ شت نە ئەگەیشت وە هەر ئەوان بوون کە بە بلاو کردنەوەي هەستو زانین و زانیـاری هەلئەسـتان جـا ئەوانیش قۆلیان هەلمالی وە دەستیان بە نووسینی کوردی کرد وە لە بەر ئەوەی کە پیویستە هەر کەس لە بابەتـی خـۆي بنوسـي بۆ نموونە پزیشـك ئەبێ لە بابەتی تەندروستی بنوسي وە ئەندازیار لە بابەتی ئەندازیاری بنوسیت و .... و ... هتد .

وە شتیکی خووارە کە داوا لە پزیشك بکریت کـه لـه بابـی ئەندازیاري بنوسیت یا بە پیچەوانە ، ماموستاکانی ئـاینیش زۆر تـر لە بابەتی خۆیان کە ئاینە رویان لە نوسین کرد وەبـێ گـومان ئاینیش بن و بناغەي هەموو پیش کەوتو بەسەر کەوتنیکە بۆ هەموو گەلیك کـه پەیرەوي بکات جا ئیستا ئەبینین نامە خانەي کوردی لە سایەی خـوواوە هەمورۆژ بە قەبالە نامەو پەرتووکی لەهەموو بابەتیکەوەئەخریتە ناوێ وەوا .

لەم رۆژانەشدا زانایيکی زور بەرزو بە ناو بانگ پەزىو کیکی بـه نرخ وبرسود .

لە باسی ئاینو رەوشت وە رێ رۆنی ژیان لە ژیـر ناوو نیشـانی « ریگەي راستی ژین لەبۆ دونیاو دین » پیشکەش بە کتیبخانەي کوردی ئەکات وە ئەم زانایە جەنابی شیخ عمر شیخ طاهاي بالیسانیە کە ئیستا امامو

خطیبو رابەری ریگەی نقشبندیة لە مزگەوتی خۆی لە گەرەکی سیتاقان لە هەولیر کە مەشهورة بە مزگەوتی شیخ عمر وە لە سایـەی خـوداوە مزگەوتوو خانەقاکەی لە ژیر جاوەدیری خۆوی روناکوو ئاودانە خودا پاداشتی خیري بداتەوە ومهیوام وایە خەلك سودیکی زۆر لە نامەکەی وەر بگری •

محمد شیخ طاها بالیساني
امام وخەتیب لە مزگەوتي
حسن البارح لە بەغدا

## بسم الله الرحمن الرحیم

١

بەناوی خودای رەحیم‌و رەحمان
ئادابی ئیسلام بۆت بکەم بەیان

سوپاس‌و ثەنا حەمدێکی لائق
بۆ ذاتی خدا صاحب‌و رازق

سەلات‌و سەلام بەبێ ئەندازە
برژێنی بە سەر ئەم سەر فرازە

ئەم‌سەر فرازە ئەم شاهبازە
شەهبازی عالەم ئەم‌دڵ نەوازە

شاهی عالەمین فەخری دوو جهان
حەبیبی خودای لەتیف‌و مەننان

بەناو محمد پەسندو شیرین .
حەمیدە ئەخلاق خۆش خوو رەنگین

خەتمی مورسەلین شاهی بۆراق سوار
پێشەوای عالەم ئەحمەدی مختار

بەغەیری خودا سەر داری مەوجود
نەتیجەی وجود حەبیبی مەعبود

لەدوای ئەم شاهە سەر گشت ئەنبیا
عمومی ئەصحاب لە گەڵ ئەولیا

گشتی زانایان ئەستێرەی ئایین
هەر کەس تابع بێ بە محمد ئەمین

## « نەصیحەت »

رۆڵە با بەشیخ هــەستە بزانــە
ئینسانی نەزان هەروەك حەیوانە
علم فێر ببە علمــە ســەر تە خــا
لە بۆ سەر بەرزی بۆ لای مونتەها
هــەر عیلمە چرای رێگــەیی دینت
علمــە پێت ئەڵێ عــەقلو ئاینت
علمە پاپۆرت لــە دەریای هیــلاك
لە هەر شەیتانێ ئەت پارێزێ چاك
علم وەك نــورە جەهــل زوڵمەتە
کوشیش کە بۆ خۆت بت بێ غیرەتە
تاجی شەرەفت بــۆ دینو دنیــا
علــمو عەمەلــە طاعەتی خــودا
علم بخوێنــەو عەمەلی پێکــە
علمــی بەعەمەل زۆر رێــك وپێکە
علمــی بێ عەمەل داری بێ ثمــر
سوکو بێ قیمەت لای هەموو بەشەر
عالمی عامــل لای خــوا مەقبولە
لە مــیراتی علم لە جێی رەســولە
بۆ ئەهلو ئەتباع شەفاعەت کارە
لە خزمەت خــودا قەدری دیــارە
عالمی بێ عەمەل هەر دەم غەمگینە
بەووبت پەرست لە یەك رەنگینــە

پێشی بت پەرست ئەچیتە ئاگر
به پێی فەرمودەی ئەحمەدی فاخر
قەت نابی ئیسلام موحتاج بەکەس بی
نابی سەر شۆڕو بەندەی ناکەس بی
ئەبی خوێندەوار ئەبێ بە فەن بی
پڕ علمو عرفان لە شکر شکەن بی
هەر علمێ هەبی لە علمی صنعەت
بناو غەواسی شتی پڕ حیکمەت
چونە ناو بحران یا چونە ئاسمان
چونە بۆشایی دەرەوەی جیهان
هەر لە دەرزیو بەن هەتا کوزەڕڕە
ئەگەر نەزانین ئاخر زەرەرە
هەر لە ئوتومبێل تاکو تەیارە
فڕین بۆ هەوا چەندی دیارە
چونە ئاسمان بۆ ناو ئەستێران
ئێوەش فێری بن ئەی نەوەی شێران
ئالاتی حەربی هەرچی کە هەیە
بۆ پاراستنی دین واجبی ئێمەیە
ئەبی کە ئیسلام هەموی بزانی
ئەگەر نا بە خوا زەحمەتە مانی

( أعدو لهـم ) فەرمودەی خـوایە
( ما أستطعتم ) تا ئاخـری آیـە (١)

علمی دنیاو دین پێـك ڕا جـوانە
دنیـا بەبێ دین گەلێ گـرانە

دینیش بێ دنیا هەرگیز ناکـرێ
چەپرەش بە یەك دەست قەت لێ نادرێ

دینو دنیامان هەر دوو وەك باڵە
فرین بەبێ بـاڵ معلوم مەحالـە

دنیا فـرێ دان بۆ کـردنی دین
حیلەی دوژمنـەو شـەیتانی لەعین

(١) ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفرموی ( واعدوا لهم ما استطعتم من قوة و من رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم (الاية (٦٠) سورة الانفال) واته ئامادە بکەن بۆ بەرامبەری گاوران هەر چەند لە تواناتان دایە لـە هێزی مالو هێزی بەدەنو هێزی چـەکوە رەش بۆشی زۆر بکەن کەبـەم هێزو رەش بۆشیە بترسنین دوژمنی خوداو دژمنی خۆتان • دانەر •

١ )ئەڕوانی بۆ ئەم شیعرە کە ئەڵێ :
ما احسن الدين والدنيا أذا أجتمعا
وأقبـح الكفـر و الافـلاس بالرجـل

واتـە : ـ
ماشاء الله چەند جوانە دینو دنیا بە یەکەوە کۆ بنەوە •
وە چەند ناشیرینو پیسە کە گاوریو هەزاری لە کەسێدا
کۆ بنەوە کە بە مەسەل دەڵێن بو کەسیکی قینزمان
لێ بێ دەڵێن دەڵێی جوی فەقیرە

هەر کەسێ بۆ دین دنیا فڕێ دا
دینە کەش ئاخر بە فیڕۆ ئەدا
ئاخیر دەبێتە دز وەیا ڕێگر
یا دەروزە کەرهە تالەگاور
یا دەبێتە بار لە سەری عالەم
دەرونی پڕ غەم هەمسوكو ماتەم
واز لە دین هێنان هۆی نەزانیە
سەر لێ شێوانو هەم نە فامیە
پشت لە دین کردن بۆ دنیا گرتن
عاقل نایکاتن ئەبەد تا مردن
دنیا بە بێ دین هەموی هی تۆ بێ
چی ئەبەی بۆ گۆڕ خۆلت بە سەر بێ
خولاسە علمی صەنایعو دین
هەموی فێر ببن بە خۆشی بژین(١)
علومی دینیش چاکیان بخوێنە
گۆێ بدە فەرمودەی شاهی مەدینە
کەلامی رەسول فەرمودەی قرآن
عەمەلیان پێ کە بە دڵو بە گیان

(١) ئە ڕوانێ بۆ ئەم ( حەدیثە یا ئەم ئەثەرە ) کە ئەفەرموێ لیس الرجل رجل الدنیا فقط ولا الرجل رجل الاخرة فقط بل الرجل رجل کلیهما •

واتە :ـ پیاو هەر ئەوە نی‌یە کە پیاوی دنیا بێتو بەس وە پیاویش هەر ئەوە نی‌یە کە پیاوی قیامەت بێتو بەس بەلکو پیاو ئەو پیاوەیە کە پیاوی هەر دوکیان بێت •

خۆشت دوور بگره له قسەی باطل
قسەی پڕو پوچ بێ مایەو طائل(٢)

غەیبەتو درۆ نەمیمیو بوختـان
بغضو عەداوەت له گەل موسلمان

هەر گیز مەیان کە بێ حەسادەت بە
پیـاوێکی ئەمین بێ خیانـەت بە

سەر سەری مەبە وەکو نا کەسان
دین دەی بە دنیا وەك هەندێ کەسان

تەماعی دنیـا لە دل فـرێ دە
هیچ کەس له دنیا نەی برد ئومێدە

خوش ڕوو ڕاست گو له گەل برایان
خوش خوو سەخی لە گەل گەدایان

رەفیقی بێ دین خۆتی لێ دوور کە
هەتا دەتوانی خۆی لێ مەهجور کە

---

(٢) ئەڕوانی بۆ ئەم فەدمودەی پێغەمبەرە ( د•خ) کە ئەفەرموێت ( من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه ) •
واتە :ـ لە جوانی ئیسلامەتی مرۆڤە کە شتی بێ سوود نە کاوە بیر بکاتەوە هەر شتێك سوودێکی دنیای حەلالی هەیە بیکا چ قسـە چ کردەوە وەهەر شتێکی سوودی قیامەتی هەیە چ قسە چ کردەوە بیکا بە لام ئەم شتانە کە نە سوودی حـەلالی دنیایی هـەیە وە نە سـوودی قیامەتی هەیە نە یکا وەکو زوربەی برادەرانی ئەم زەمانە بە قسەی پڕو پوچو بێ فائیدە مەجلس ئەبەتە سەر ئەوە عومر بە زایع دانە وە تەمەن بەفیرۆ بردنە •

ئەوامری خـوا باش بە جێ بێنــە
عمرت بە گوناە قــەت مەگزەرێنە

دلی گـوناە کار دائما تەنگـە
پڕ غەموو خەفەت هەمووی هەر ژەنگە

بێ کینەو خاوین سینەی صالحان
بێ دەردو بێ غەم لە هەر دو جیهان

ئەرکانی ئیسلام ئەرکـانی ئیمان
گوێ بگرە یەك یەك بۆت ئەکەم بەیان

## « باسی ئەرکانی ئیسلام »

ئەرکانی ئیسـلام بزانــە پێنجن
زانینو کردنیان بۆ قیەمات گەنجن

هەر کەس کەمی کا لەم پێنج روکنانە
بەقــەدەر کــەمی دینی نوقسانە

یەکەم شادەیە دووەم (صلاتە)
سێ یەمین رۆژی چـوارەم زەکـاتە

پێنجـەمین حەجـی کەعبةاللّهیە
هــەر کەس لە وسعو تاقەتی دایــە

## « باسی شادەو مانا کەی »

روکنی یەکــەمین کەلیمەی شــادە
بزانــە چیەو چی لێ مـرادە

ئەبێ لەفزە کەی راستو جوان بێ
بێ گرێو غەڵەت چاکـی ڕەوان بێ

ماناکـەی ئەبێ یـەك یەك بزانـی
سەعی لێ بکـە هەتا دە تـوانی

بە دڵ باوەڕی ئەبێ پێ بکا
هیچشكو شوبهەی قطعـا لێنەکا

ئەگەر لەفـزە کەی بـە غەلەت بڵێ
شەرعا بە تاڵە ڕاسـتی پێ بڵێ ..

یا خۆ مەعنا کەی هەر کەس نەزانی
شـادەی بە تاڵـە تا کو ئەیزانی

یا باوەڕ نـە کا مانایی شـادە
بێ شك کافـرە دوورە لە جـادە

( أشـهد ) یانی بـە دڵو زوبـان
باوڕمـەو ئەیلێم بێ شـكو گومان

( آن لا اله ) هیچ خـدای بە حـەق
نینـە ( الا الله ) ئەوزاتـی موتلەق

آلا خـوا نەبێ نـاوی ( الله )یە
بیژنو منـال بی بـاب ودایـە

( اشـهد )یانی اشـهد بالله
آن محمـداً رسـول الله

یانی محمـد کـوری عبدالله
پێغەمبەری خـوا قاسـدی الله

هەرچی فەرمویتی خلافی نیە
ریگەی نەجا نمان ئیتاعەی ویە
هەر کەسێ لادا لە ریگەی رسوەل
لای خوا کردەوەی نابیتن مەقبول(١)
ریگا کانی تر هەمووی بەتالن
سەرا سەر هەمووی گومراو ضەلالن

## «باسی نوێژ»

روکنی دووەمین روکنی نووێژە
ئەوەل تا ئاخر بیکەو بی بیژە
ئەوەی نویژ نەکا وەکو شەیتانە
بناغەی دینی چونکە وێرانە
فەرمایشی خوا حەدیثی قدسی
مەلعونی ئەکا گەر لێی ئەپرسی(١)

---

(١) ئەروانی بۆ ئەم ئا یەتە آل عمران آیە ( ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخرة من الخاسرین ) واتە هەر کەس کە بیەوێ عەیری ئسیلامە تی کە ریگەی پێغەمبەرە ریگەیەکی تر پەیدا بکا لێی وەرناگیری وەرەنج بە خەسارە •

(١) ئەروانی بو حەدیثی قدسی کە ئەفەرمووی تارك الصلاة ملعون وجاره ان رضی به ملعون ولولا أنی حکم عدل لقلت کل من یخرج من صلبه ملعون الی یوم القیامة واتە نویژ نەکەر لە رەحمەت دورە وە دراوسیشی ئەگەر پێ رازی بی لە رەحمەت دووزە ئەگەز لە بەز ئەوە نەبی کە من حاکمێکی عەدلم کەس بە گوناهی کەس ناگرم دەم گوت هەر کەسێ لە پشتی نویژ نەکەر پەیدا ببی تا قیامەت هەموویان مەلعونن ومدوور لە رەحمەتن •

مەلعو نی واتە دووری لە رەحمەت
لە بو نویژ نە کەر فەرموودەی حەزرەت
وەکو شەیتانە لە رەحمەت دوورە
جیرانی مەلعون هەر بەم دەستورە
نویژ نەکەر گەر بێ بێ تۆبە بمری
نابێ بشوورێ و کفنیشی بکرێ
ئەبی فرێ دەن وەکو لاشەی کەر
نویژی سەر نەکەن نەیبەنە مەقبەر
یەك نویژ بەقەستی هەر کەس بچوینی
دەبێتە کافر دینی نامینی (٢) ..
یەك نویژ بەقەستی هەر کەس بچوینی
شرعاً دەکوژرێ و حەلاڵە خوینی
بەو شەرتەی فیتنەی لێ پەیدا نەبێ
وە قاتلە کەش بەر بەلا نەبێ
ئەوەی لە شەرعی بەیان کراوە
لە شەرتو ئەرکان شەرحی دراوە
بە گویرەی شەرعی ئەبێ بیزانی
ئەگەر بە راستی خاوەن ئیمانی
زەڕەیەك لە نویژ یاخو لە دەست نویژ
ئەگەر ڕاست نەبێ بەتاڵە ئەو نویژ

(٢) ئەروانی بۆ ئەم حەدیثە من ترك الصلاة متعمدا فقد كفر جهارا (جامع الصغير) واتە هەر کەس نویژ بچوینی بە قەستی بە تەحقیق کافرو گومراە دەبی وە ئاشکرا وبێ پەردە پەسیو لە دین دەر ئەچی .

ئەگەر نازانی پرسە لە مەلا
زوبانت هەیە الحمدللە
تەنبەلی مەکە هیچ لە عبادەت
هەر عیبادەتە مایەی سەعادەت
ئاخر مردنە دنیا بە تالە
غەیری عبادەت هەمووی ضەلالە
مالو خەزینە یاقصرو دوکان
سودی بۆت نیە لە ناو گورستان
خزمو کەسو کارهێزو سەلتەنەت
قورتارت ناکەن بت بەنە جەنەت
قونبلەی زەری وەیا هیدروجین
کە تۆ رویشتی ئەمانەت بوچین
ئەوەی سوودی بێ کردەوەی خۆتە
بیر کە لەمانە کەوا کردوتە
ئەگەر لات چاکە سوپاسی خوا کە
گەر لات خەرابە دەردت دەوا کە
دەرمانی دەردت گەڕانەوەیە
ئیتاعەی خوداو پارانەوەیە
دانەوەی حەقی ئادەمیزادە
بۆ قەزای واجب خۆت کە ئامادە

## « باسی دەست نویژ »

تارمت باش بگرە بە گویرەی شەرعی
نازانی پرسە لە ئەهلی شەرعی

فەرزی دەست نویژێ بۆت بلیم تەواو
شەشن بزانە هەمووی ناو بە نـاو

یەکـەم نیەتە دووەم دەمـو چـاو
شورینی هەمووی بەخلاسـەی ئاو

سێیەم هەردوو دەست هەتا هەنیشك
بیشو بە چاکی لە گەڵ کوریشك

مەسحی بەعضی سەر فەرزی چارەمین
پی شوتن تاقاپ فـەرزی پێنجەمین

شەشەم تەرتیبە هەر وەکو گوترا
ئایـەی (فأغسلوا) وائەمر ئـەکا

## « باسی شەرتی دەست نوێژ »

پیت بلێم پێنجن شروتی دەست نوێژ
یەکەم ئـاوی پاك وێسـتا بی یالێژ

ڕوون بێو بە پیسی شیلو نەبو بێ
بێجگە لەم جارە مەعمـول نە بو بـوێ

دووەم لە شەرتـان ڕۆیشتنی ئـاو
ئەندامی دەست نوێژ دابگرێ تەواو

---

(١) ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە ( فاغسلوا وجوهکم وأیدیکم الی المرافق وامسحوا برؤسکم وارجلکم الی الکعبین ) سورة المائدة آیەی (٦) واتە دەموو چاوتان بشۆرن بەتەوای وەدەستان بشۆرن هەتا هەنیشك وە دەستی تەڕ بە سەر تا داینن وە هەرْ وەها پیە کانتان بشوون هەتا گوێزینگ وقاب •

سێیەم بۆ دەست نوێژ پاکی (اعضایه)
لە هەر چــی ڕەنگاو بدا وەك چایــه

هەرچی مانع بێ لە ئاو جاری بوون
ئەبێ لایان خەی وەسمەو وەك ڕوون

ئەمه چوارەم بو پێنجــەم ئەمەیــه
لە بــو (سلیس) وموستەحاضەیه

کەدەست نوێژی شوت ئەبێ هەڵستی
یە گورجــی نوێژی زو دابەســتی

## « باسی شکانــی دەست نوێژ »

ئەوەی دەست نوێژی پێ بەتاڵ ئەبی
چــارن بزانه تاگــومڕا نەبــی

هاتنە دەری شت لە پێش یا لە پاش
دەست نویژ دەشکینی ئەیبا بە بەلاش

دووەم عەقل چوون دەست نویژ دەشکینی
بەشێتی بــڕوا یا بــه بێ دینــی

بەری دەست کەیە عەورەتی ئینسان
زیندی یا مردی هی خۆت یا کەسان

پێوە بی یا خۆ لێ وە کراوەبی پێشە یا پاشەیاجێی بڕابی

(۱) سلس : ئەو کەسەیە کە میزی را نەوەستی چ پیاو چ ژن ر۲
موستەحاضە ئەو ژنەیە کە خوینی ڕانەوەستی لە کاتی پاکی و کاتی
حەیزدا خونی هەر بێنی .

دەست نویژ ئەشیێكنی بە هەر تەرزابێ
دەست نوێژ شوتنە وەت لە سەر فەرزە بێ

پیستی پیاو ژن ئەمما نا مەحـرەم
لیك بخشێن دەست نۆیژ ئەكاتن عدەم

هەر جێ یەكـی بی جیـاوازی نیـە
ژنتـو نا مەحـرەم هیچ فەرقی نییە

## « باسی ئەركانی نۆیژ »

ئەركانی نووێژ بـۆت بكەم دییـار
ئەوەڵ تا ئاخـیر چـواردەن بە ژمار

نیەتی عیبـادەت یەكـەم ئەركانـە
تا ئەهلی نیفـاق نە لێن ئیدمانە(١)

دووەم گـۆتنـی الله آكبـر
بەم ووشـە نەبی نیـە معتبر

لە كاتـی ووتنی ئـەبێ عاقـل بی
لە عەینـی نوێـژ نابێ غافـل بی

كردنو فـەرز لە گـەڵ تەعینـی
خەیاڵ كـە كاتی كـە نیەت دینـی

---

١) ئیدمانی ریاضە وە یا وەرزش وەهەم اشارەیە بۆ حەدیثی ( أنما الاعمال بالنیات وانما لكل امرء مانوی ) واتە بە سندنایی هیچ كردەوە الا بە نیەت نەبی وەتەبوول ناكرێ بۆ مروف الا ئەوشتەنەیی كە نیەتی لە سەر بووە خلاصە فەرا یە بە نیەت ناگورێ هەر خرابە یەیەلام چاكە هەز كەسە بیكـا بە نیەتی چاكە تەبی لێی وەر ناگیرێ ومقبول نابێ •

روکنی سێیەمین بۆ خاوەن تاقەت
ویستان بە پێوە بە ئیستراحەت
لە بۆی (بسم الله) تانونی (ضالین)
روکنی چارەمین فاتیحەی شیرین
لە هەر رکعەتێ ئەبێ بخوێندرێ
واز لێ هێنانی هەرگیز ناکرێ
شەددە یا مەددە یەك کەلیماتی
یا یەك لە حەرفان یا تەرتیباتی
بەغەلەت بلێی لێت قەبوول نابێ
لەحەشرەبینی بەلاو عقابی
پێنجەم رکوعە ناو لەپ لە سەر چۆك
شەشەم هەلسانی بەبێ گرێو سوك
حەوتەم دوو سەجدە لە هەموو رکعەت
هەشتەمدانیشتن لە بەینیسەجدەت
روکنی نۆیەمین باش قەرار گرتن
لەرکوعو هەلسان سەجدە و دانیشتن
دەیەم تەحیاتە تاپیش سەلەوات
یانزەم سەلەوات لە محمد بدات
ناو بردنی ئال لەم سەلاوەتە
لای قەدیم واجب جەدید سونەتە

(٢) تەروانی بۆ ئەم حەدیثە ( لاصلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب )
واتە هیچ قەبوول نیە بۆ ئەو کەسە کەسەراەتای ر قورئان کەپێی ئەلێن
فاتحە تیدا نەخوێنی ٠

دانیشتن لەبۆ خویندنی تەحیات
روکنی دوانزەمە یت بێتن نەجات

روکنی سێزدەمین سەلام دانەوە
چاردەمین تەرتیت وەك خویندمانەوە

## « باسی شروتی نوێژ »

ئەمە ئەرکان بوون پینجیش شروتن
لای خوداو رەسول بەنوێژ مەربووتن

یەکەم دەست ئوێژو بێ جەنابەتی
دووەم پاکی لەش چێگەو جلیەتی

سێیەم عەورەتت ئەبێ بزربی
چارەم بوونی نوێژ ئەبێ زهور بێ

پێنجەم رووی بەدەن بۆ کعبة الله
رویدلت ئەمما بکە لای الله

ئەم تەرتیباتە یاشیان بزانە
بە دوڕو گەوهەر پاکیان بزانە

باشتری عەمەل نویژی ئەوەل کات
پێغەمبەری خوا وا خەبەر ئەدات

مادام کەوایە تەئخیری مەکە
زوو بە زوو بیکە تەقصیری مەکە

---

ئەرۆاتی بۆ ئەم فەرمایشەی پیغەمبەر ( افضل الاعمال الصلاة اول وقتها )
واتە گەورە ترین هەموو کردەوەیەك نوێژ کردنە لە ئەوەل کاتی نوێژ .

لەکاتی نوێژدا غەفلەتت نەبی
بەما سوی الله سەکرەتت نەبی

دڵت ڕاگرە بۆفەیزی خودا
تا ژەنگی غەفلەت لەدڵ لابیا

وەك مشتو ماڵە نوێژ لە بۆ ئینسان
کە ئاگادار بی لەزاتی یەزدان

ڕوویی ( أیاك ) لەزاتی خواکە
ئەوجا چیت ئەوێ لەئەو داواکە

دەرت ناکاتن لەدەرگانەی خۆی
دلت مۆر ئەکا بەنیشانەی خۆی

ئەوجا خەنی بە کەبەندەی ئەوی
مەقبوولی دەرگەو و بارەگای ئەوی

لە دوعای خیرت لەیادمان مەکە
بۆ رەحمی خودا لەبیرمان مەکە

---

ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە (یاایها الذین امنوا لا تقربوا الصلاة و انتم سکاری حتی تعلموا ماتقولون ) الایة (٤٣) سورة النساء .

واتە نەی ئەو کەسانەی کەبیرو باوەرتان هینایە بەخو او پیغەمبەر نزیکی نوێژ مەبن لەوکاتە کە ئێوە سەر خوشن هەتا واتان لێ دێ کە دەزانن چی دەلێنو مناجات لە گەڵ کێ دەکەن وە ئەمسەرخوشیەعامە چم بە خەیالا سەرخوش بن ئاکاتان لە فاتحەتەبی یابە دالغە لێدان ئاگلو لەنوێژ نەبی یا بە عرف و شتی بێ دینی سەر خۆش بی .

وە گیلو بی عقل بێ

## « باسی رۆژی »

رۆژووی رەمەزان سێیەم ئەر کانە
گەر رۆژی نەگری مالت وێرانە

بە رۆژی گرتن دلتەبی سافی
لەمەو دوا چاکتر خودا ئەناسی

لەهەر دوژمنی خراپ ترو بەد
نەفسی خۆمانە وا لە ناو جەسەد
گەر نەی ترسینی علاجت ئەکا
ریشەت دەر دەینی هیلاکت ئەکا

ەلێ چ هیلاك هیلاکی ئەبەد
ریسوات ئەکاتن لای خودای صەمەد

گەر بی ترسینی هێزی نامینی
لە دوژمن داری نەختێ واز دینی

مەعلومە نەفسیش بە هیچ ناترسی
مەگەر جار بە جار بیکەی بە برسی

لە بەر ئەم (سررە) پاشالی یەزدان
دای نا بۆ ئیمە رۆژووی رەمەزان
واجبی کردیە کە هەموو سالێك
بگرین رەمەزان بە هەر چی حالێك(١)

---

١ ـ ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە ( وان تصوموا خیر لکم ان کنتم تعلمون ) واتە روخسەت هەیە بۆ رۆژی خواردن کە سەفەرە ساغیە بەلام بە روزی بون چاکترە بۆ ئیوە ئەگەر ئیوە بزانن ٠

سودەکەی تەنیا هەر بۆ خۆمانە
اسـتغنای خـودا لە هەمـوو ماثە(٢)

تا نەفسی هارمان تەنبیهاتی بی
وەك ئەسپی سەر کەش تەعلیماتی بی

مەگەر بە گوناە موبتەلامان کا
لائق بە ئاگر گشت بەلامان کا

تاخۆی ببینی کە نا ڕەواجە
بە رازقی خۆی هەر دەم موحتاجە

بە یەك نان دەمری هەم دە ژیتەوە
جا خۆی دەناسیو دە گەرێتەوە

جا واز دەهێنی لە غروریو هاری
ڕوو دەکاتە لای پەروەدی گاری

جا بۆ ( ئیتاعە ) فەرمان بەردار بی
لە گەل ئیتاعەش هەر شەرمەزار بی

کەمایەتی خۆی گەورەی خووا
لە پێش چاوی بی هەمیشە نەڕوا

---

٢ )ئەزوانی بۆتەم تایەتە کە ئە نەزموی (فان اللة غنی عن العالمین)واتە خوا موحتاجی هیچ کەس نیە هەر شتێك کە ئەکەی لە خوا پەرستن سودی بۆ قومانە سودە کەی بۆ خوا نیە خوا هەر خوایە چ بەرستین چ نەی بەرستین •

بۆیە هەر کەسێ رەمەزان نەگری
نەفسی لە هاری ئاگر وائەگری
خۆی بە موحتاجی هیچ کەس نازانی
لە بەر مەغروری دەبیت توغیانی
لە سالی دووەم لە مانگی شەعبان
پاش کۆچ کردنی سەییدی عدنان
رۆژی واجب بوو لای خودای مەنان
ئەو جا دیار کرا مانگی رەمەزان(١)
نی یەت واجبە بۆ هەموو رۆژی
ئەمما بە شەو بی نەیخەیە روژی
رۆژی کە دەگری هەر چی کە هەبی
ئەبی دائما لە گەل نی یەت بی
تەعین واجبە بۆ ئەم نی یەتە
فەرزە یا نەزرە یا خۆ سوننەتە

---

ئەروانی بۆ ئایەتە (یاایها الذین آمنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون ) الایة ١٨٣ سورة البقرة .

واتە ئەی ئەو کەسانەی بڕوایان هینایە بەخواو پێغەمبەر نوسراوە لە سەر ئێوە لە تەرف خواوە رۆژی گرتن هەر وەکو لە سەر ئومەتەکانی پێشوی ئێوەش نوسراوە وە واجب کراوە کە بگرن تا کو واتان لێ بێ تەقوا بکەن خۆتان لە خرابە بپارێزن لە ترس خودا .

روژی مەنع بوون لە ئاوو خـواردن(١)
لەو ئیشی کـە پیاو نەکا لە گـەڵ ژن

هیچ شتی بۆ ژور نە ڕوا لەهیچ کـون
بـەلام شـریقە زەرەر ناداتـن

هـەم دور کـردنی باقی اعضـاکان
لە هەر گـوناهێ وەك درۆو بوختـان

نەمیمیو غەیبـەت لێدان وجـوندان
افتـراو نـەزەر زولمی مـوسلمان

دەست دریژ کـردن بۆ ماڵی عالـەم
رۆژی نایـەلێ نە زۆرو نـە کـەم

---

(١) ئەڕوانی بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرموی ( وکلوا واشربوا حتـی یتبین لکم الخیط الابیض من الخیط الاسود من الفجر ) آیة ١٨٧ سورة البقـرة •

واتە بخۆنو بخۆنـەوە هـەتـا ئاشکرا ئەبی بۆ ئێو بەنی سپی لـە بەنی رەش لە ئـەوەل بەیان دان وە لە یەك جیا دەبنەوە یانی فەجـری، کاذب وەفەجری سادق لە یـەك دەر ئەکەون وە ئەم جیا بونەوەش چ بـە ئالەت بی ینی کاتژمیر یا بە دیتـی چاو بی ئەوەش بۆ ئەو کەسی سەعاتی لا نیە وەلای بەیانیش سامال بی هەور نەبی •

(٢) ئەڕوانـی بۆ ئـەم ئایەتـە پیرۆزە کە دە فەرمووی أحـل لکـم لیلة الصیـام الرفـث الی نسـائکم )سورة البقرة ٨٧ •

واتە حەلاڵ کرایە بۆ ئیوە لـە شـەوەکانی روژی دا مەیل کـردن وەلای ژنتان بـۆ ئیش یێك هینانـی شـتی بەینی یەو ژن واتە لـە رۆژدا ئەم شتە حەرامە وە لە شەو حەلالە •

هەر کەس لە گوناە خۆی مەنع نە کا
لە وەختی ڕۆژوو بێ شەرعی بکا
وەك حەیوانێکە پەتك کرابێ
لە ئاوو خواردن مەنع کرابێ (١)
هەر وەك بۆ حەیوان ڕۆژی نا نوسرێ
بۆ گوناه باریش هەروا نا نوسرێ
فتوایان دایە هەندێ عولەما
ڕۆژی گوناە کار بێ فایدە ئەڕوا
ڕۆژی لە دونیا مایەی صیحەتە
ئەجری لە قیامەت هەر مەغفیرەتە
بۆ ئادەمیزاد هۆی هیدایەتە
( هدی للناس ) دەقی ئایەتە (٢)

---

(١) ئەروانی بۆ ئەم حەدیثە ( کم من صائم لیس له من صومه الا الجوع والعطش ) امامی غزالی ریوایەت لە ئەبو هورەیرە دەکا .

واتە زۆر کەس هەیە لەرۆژی گرەکان هیچ بەشیان لە ڕۆژی تیە الا برسیەتیو تینیەتی نەبێ هیچ خێریان بۆ نانوسرێ چونکە ئەمانە ئەندامی خۆیان پاس نەکردیە لە گوناە .

(٢) ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرموی ( شهر رمضان الذی انزل فیه القرآن هدی للناس ) سورة بقرة اية ١٨٥

واتە مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتوو ئە خواربۆ ریرونکردن بۆ ئادەمیزادئەما ئەمە بینا لە سەر ئەمەیە کە ( هدی للناس ) حالْ بی لە رەمەزان کەمضاف الیەیە چونکە حال لە مضاف الیە دروستە .

بێ عـوزر هەر کـەس ڕۆژو بشکێنێ
لای خـودا ئەبەد قـەدری نامێنـێ
نەفسەکەی پیسی کردیتە مەعبـود
ڕۆیێ لـە دونیـا ناگا بە مەقصـود
جەزای پاش مـردن گـورزی گـرانە
ئاو خـواردنی هـەر وەك سـندانە

**« باسی زەکات »**

ڕوکنی چوارەمین لە ڕوکنی ئیسـلام
زەکـاتی ماڵـە دەری کـە تەمام
واجـب کراوە لـە سـالی دووەم
لە پاشی کۆچـی سـەیدی خاتـەم
هەر کەسـی زەکات واجـب نەزانـی
شـەرعاً کافـرە بە بێ گـومانی
جەبرەن ئەسیندرێ لەو کەسی نەیدا
وەلـەو کوشتنی لـێ ببی پەیـدا
زەکات واجبـە لـە پارەو لە قـوت
مالی تیجـارەت چێرۆکـو گاجـووت
لە بـزن‌و ووشتر یا خـو لە مـەربی
لە سەر هەر کەسێ صاحب قـەدەر بێ
لە قەسپ‌و مێوژ لە کەشـکو پەنیر(١)

---

(١) زەکاتی کەشك‌و پەنیر لـە لای هەندێ عولەما وایە زەکاتیان لێ دەر دەکرێ چونکە ئەوانیش قوتـن ئینسان پێ دەژی وە هـەر شـتێك ئینسـان پێ بژی زەکاتی لێ دەکەوی •
دانەر

زەکات دەر ئەکرێ ئەدرێ بــە فەقــیر
قورئــانــی پــیرۆز نوویژو زەکــات
ئەغلــەب پێکــەوە باسیان دەکــات
هەر کەس کــە نەدا زەکــاتی مــاڵی
نویژیشـــی دەروا وێرانــە ماڵــی
بەگاوری مشــرك جســابی دەکــا
لە قــورئانێ دا خــودای تعالــی(١)
نوێــژو زەکاتت لە یــەك پێچــراون
هەر کەس جیایان کا لە دین پچــراون
ماڵــت رەحمەتــە نعمەتی خــوایە
مەیکە بــە غەزەب ئاگــرو بــەلایە
ماڵو خــەزێنە قــوتو دەفینــە
زەکاتیان نــەدەی گشــتی گورینــە
سۆر ئەکرینــەوە لە نــاو جــەهەنەم
داغ ئەکــرێ پێیــان بە زێــدە ئەلەم

---

سورة فصلت الآية ٦ـ٧

(١) وویل للمشــركين الذيــن لايؤتون انزكاة وهم بالاخرة هـــم كافرون » واتە هیلاك بۆ ئەو مشركانە کە زەکــات نــادەن وە ئەوانــە بــە قیامەت كافــرن واتــە ئیمانیان نیــە ئەگەر ئیمانیان هەبوایە زەکاتیان ئەدا وە بــۆیێش پێیــان دەڵێن مشــرك چونكە لە بــەر خۆشــەویستی مــال ئەمری خودایان شکاندیە مالیان پــێ خۆشەویسترە لەم خودایە کــە ئــەو ماڵەی پێ داون •

به نەسی ئایـەت قـورئانی مـوبین
داغ ئەکرێ پشتو تەنیشتو جـەبین
سەریحی قـورئان وا خەبەر ئـەدات
لاتلمنـی یمانـع الزکـات (٢)
ئیرادەی خـودا وەهـای دانـاوە
رزقـی فەقیری لای تـۆ دانـاوە
لە سەر فەقیریش هیـچ مەکە منـەت
مالی خـۆیەتی ئەیـدەیەوە دەسـت
خـودای تعـالی عیلمی تـەواوە
بە گوێـرەی عالـەم رزقی دانـاوە
ئەمما بـۆ چـەرخی نیظامی عالـەم
تا ببی کـاریان بـە یەکتر موحـکەم

(٢) ئـەرواى بـۆ ئـەم ئایەتە « والذين يكنزون الذهب والفضـة ولا ينفقونها فى سبيل الله فبشرهم بعـذاب أليم يوم يحمى عليها فى نار جهنـم فتكوى بها جباههم وجنوبهم وظهورهم هذا ماكنزتم لانفسكم فذوقوا ماكنتم تكنزون » سورة التوبة الايـة ٣٤ـ٣٥ واتە ئەو کەسانە زێرو زیو دا ئەکەن وەلەریگەی خـودا سـەرف ناکـەن موژدەیان پێ بدە بە عـەزابێکی زۆر بە ئێش لەو ڕۆژەی کە ئەم زێرو زیوە سۆر ئەکرێنەوە داغ ئەکرێ پێیـان ناو چـاوانو تەنشـتو پشـتی خاوەندەکەیان وە پێیان دەڵێن ئەوەیە کە بۆ خۆتان داتان کردبوو لەدونیا جا بچێژن ئەو شتە کە بۆ خۆتان داتـان کـردبوو • ائی بینی وە ئـەو پـارەی ئیستاش ئەگەر چی کاغـەزە بـەلام چونکە رەسیدی زێری هەیە هەر بـە زێر حیسابە بۆ ئەو کەسانەی یاغی بن زەکاتی لێ نەدەن عەینی شتە • « دانەر »

هەندێ فەقیرن هەندێ خاوەن ماڵ
غەنی بۆ هەژار کردوتە حەماڵ

هەندێ پزیشکن هەندێ نەساغن
هەندێ ڕوتوو قوت هەندێ بە باغن

هەندێ ئەندازیار هەندێ عەمەلە
هەندێ چالاکە هەندێ تەمبەڵە

بەڵام هەموویان موحتاج بە یەکن
بە هەموان ئەو جا زۆر ڕێکو پێکن

هەموو ئیشو کار بە یەك ناسوڕێ
ئاسنگەر مەعلووم بەرگ نادورێ

فەرمانبەر ناشێ قوڕکاری بکا
قوڕکار نازانێ ئیشی ئەو بکا

پیشەساز ناکرێ ئیشی تر بکا
ئەندازیار ناشێ ئیشی قوڕ بکا

خاوەن پول موحتاج بە ئەندازیارە
هەر دوکیان پێویست بە کرێکارە

کرێکار موحتاج بە هەر دوکیانە
هەموشیان موحتاج داسی سەپانە

گەورەوو گچکە بە یەك موحتاجن
بێ یەکتر هەر دوك زۆر ناڕەواجن

هەمووشیان پێ ویست بە ئایین زانن
ئەگەر نا بە خۆ دینی نازانن

بۆ دنیاش زانا پێویست بەوانە
خزمەتی بکەن بە بێ بەهانە
ئادەمی هەمووی خادمی یەکن
هەمووی بە کاری یەکتر خەریکن
شعور کەن یان نا ئیشەکە وایە
خوذای گەورەمان وەهای دانایە
نیزامی دنیا وەها ئەسوڕێ
خودا مەیل کا حالیان دەگۆڕێ
فەقیر ئەکاتن بە خاوەنی ماڵ
ماڵ دار دەکاتە فەقیری بێ حاڵ

## ( باسی سەر فیترە )

بەشێ لە زەکات مەشهورە فیترە
ئەویش واجبە بە بێ خەتەرە
لە ساڵی دووەم لە پاشی هیجرە
وەکو رەمەزان واجب بوو فیترە
لە سەر هەر کەسێ زێدەی لە قوت بێ
بۆشە ووروژی وەلەو پەرپوت بێ
لە سەر گەورەی ماڵ واجب ئەدایە
بۆ هەر کەس لە ژێر فەرمانی دایە
بۆ هەر سەر ساعێ تەقدیر کرایە
ساعیش چوار موددە وەها دانرایە

تـا فیتره نـەدرێ ڕۆژی مەقوفـە
بە ڕەدوو قـەبوول نابێ مەوصـوفە
قەبوولی مەشـروت بە فیتره دانـە
فیتره گـەر نەدرێ رەددی ئاسـانە
«تشبیه» کـراوه فیتره پـاش ڕوژو
بە سەجدەی پاش نوێژ لە جیاتی سەهوو
هەر وەکو سەجدە پینەی نوێژ ئـەکا
تۆڵەی کەمی بۆ خـاوەن نـوێژ ئەکا
فیترەش بەم نەوعە پینەو سـەد ئەکا
کـە لێنی رۆژو هـەمووی پڕ ئـەکا
لـە قوتیش کـامیان غالبە بوخـرێ
ئەبێ لـەم قـووتە فیترە دەر بکـرێ
ئەمما فووتی ساڵ نەك قووتی جێژنە
جەهـلو نـەزانین لە دڵ دا بـڕنە
مەقسوودی خـودا لە دانی زەکـات
ئەمەیە زەکـات بە راسـت دەر بکات
تا حـوببی مـالی لـە دڵ دەر بچـی
مەگەر بەو حووببە خودای لە بیر چـی
موستەحـەق ئەبی فعـلا وەر بگـرێ
تاکـو پێویستی پـێ دەفع بکـرێ
مادام کـەوایە هەر کـەس بـە حیلە
سـەبەب بە ئەمە چـونکە رەزیلـە

له گەل کـەسێکی بێتـو ڕێك کـەوی
هەر چەنـد زەکاتی کەڕا لێی کـەوی
تەسلیمی بـکا مـەبلەغی پـارە
له پـاش تەسلیمی ئـەمجا دووبـارە
وەر بگریتەوە هەر چەنـد کـە دایتی
بینێتـە گـیرفان بێ موبالاتـی
دروست نییە ئەمە بە دینی ئیسـلام
ئەگـەر ئیسلامی تـۆ مەیکە بـرام
حیله لە خـودا هـەرگیز ناکـرێ
گـەر ئیمـان داری بکە بـاوەڕی
خودا لـەم حیله هـەر گیز نابـووری
دینیش مەعلومـە بەتـۆ ناگـۆرێ
بە حیله جـەزای ئـەم حیله ئـەدات
بۆ تۆ ئەپیوورێ بـەوی کـە پیـوات
لە قیامەت دەت بەن بۆ ناو سندوقێ
هـەر بە دیتنی ئینسـان وەتۆقـێ
جا لە ناو سنوق تۆ ئەکـەن مەحـکەم
دەت بەن بەم حاڵە بۆ نـاو جەهەننەم
هەر چەنـدی بڵێی زەکاتـم دایـە
یا ئـەم حیلەیە مـەلا داینایـە
لێت قەبوول ناکەن لە گەل مەلاکەش
ئەوبـەن بۆ ئاگـر بە بێ کەشاکەش

پێت ئەلێن ئێمــە ســندوقی ئەبەین
بۆ هیــچ عەزابێ دەخلی تۆ ناکــەین
بە هیچ جۆرێکی بــاری خــوا نابەین
جا هەروا چــاکە ئیتــاعەی بکــەین
مەلا قور بەســەر ئــەم حیلە چــی‌یە
رزقی تــۆ لە ســەر ئەم کەســە نی‌یە
دینــت مەفرۆشــە بە نەختی پــارە
دین بە دنیــا دان جــەزای هــەر نارە
پارەکەش ئەبرێ دینە کەشــتە چــی
بــە دەس بەتاڵی ئاخــیر دەر دەچــی
لە خزمــەت خــودا تــۆ ئەمینداری
لە بۆ ئــەم دینــە تۆ خــەزنە داری
خیانەت مەکــە لەم دینــە پاکــە
لە خــوا بترسێ هــەر ئەوە چاکــە
لەمەو پاش مەکــە حیلە لە بۆ کــەس
ئەگەر ئیمانت بە خوا هــەبەیە پــەس
لۆمەشمان مەکە لە سەر ئــەم قســە
گوتنی ئەم حەقە واجبی هەر کەســە
خۆشت مەعلومــە بە دڵ نــارەزای
بەم فێلە ئەگــەر پیــاوی خــودای

**(باسی حەج لە گەل عومرە)**

روکنی پێنجەمین لە روکنی ئیســلام
حەجــی بیت‌الله حجــة الاســلام

سالی شەشەمین لە پاشـــی هیجـرە
واجب کـراوە حەج لە گـەل عومــرە

لە سەر هەر کەســێ تەواناى هــەبێ
هەم ڕەزاى خودا بێ توو غایەى بێ(١)

هەر کەس مانیع بێ عومرەو حەج نەکا
سستىو تەمبەلی بە ئەم روکنــە کا

لە کاتی مــردن لە بــوي دائەنــرێ
بە جوویی یاخۆ بــە دیانی بمــرى(٢)

---

٩ نیرە جیگەى ڤسەیە مجمد

(١) ئەروانـــى بۆ لـــەم ئایەتـــە « ولله علي النـاس حـج البيت مـن استطاع اليه سبيلا ومن كفر فـان الله غني عن دلعالمين » آل عمران الايـة ٩٧ واتە لە بۆ خوداى تعالی هەیە لـە مرۆڤ کـە حەجـى بەیتـى خـودا بکەن کەس کە لە تواناى بی وەکافر بی حەج نـەکا خـــوداى گـــەورە پێویست بەکـەس نی‌یە لـەم ئایەتەوەر ئەگیرى کە بە نەکـردنى حـەج مرۆڤ کافر ئەبێ وەلە ئیســلام دەر ئەچیت خودا بمان پارێزى •

(٢) ئەروانى بۆ ئەم فەرمایشی پێغبەرە کە ئەفەرمـوى « مـن ملك زاد او راحلة تبلغـه الى الحـج ولـم يحج فلا عليه أن يمـوت يهـوديا او نصرانيا » واتە کەسێ ئەوەندەي هەبێ زادي خۆیوو ملو منالي مسۆگەر بی تا لـەـ حـەج ئەگرێتـەوە مالـی وە ولاخیشی هەبی یا بتوانێ بەکرێ وە لەگەل ئەم هەووبونەش حـەج نەکا چي لە سـەر نیـیـە واتـە گلەیي نییە کە ئەم کەسـە بە جولەکەیی یا بەدیانی بمری چونکە بە ئیســلامی نامرى لە بەر ئەم ئایەتە کـە ئیســتا تەفسیرمان کرد •

به حەجی مەقبـول دا ئـەڕنێ ئینسان
له کیفی گـوناه دەر دێ بـه ئاسـان

بڕو حـەج بکه دەولەمەنـد ئـەبی
گوناه نامینیو هـەم پەسـند ئـەبی

به حەجـی مەقبـول نابینی جـەزا
به غەیری بەهەشت له لایەن خـودا(١)

جا با پیاوبن هەر کەس حـەج ئـەکا
له پاش هاتنەوەی خۆی ناکەس نەکـا

لەم عومری مایتـی خـۆی بپارێـزی
پیس نـەکا ئیتر چـیدی پەرێـزی

(١) ئەم دوو شیعرە ئەروانی بۆ لەروونی بـۆ ئـەم فەرمایشـی پێغمبەر که ئەفەرموێ « تابعـوا بین الحج والعمرة فانهما ینفیان الفقـر والذنـوب کما ینفـي الکیر خبـث الحدید والذهب والفضة ولیس للحج المبرور جزاء الا الجنة » واته حـەج له دوو عومره وەعومره له دوای حەج بکەن واته به زۆری بیان کەن چونکه حـەج و عـومره فەقیریو گـوناه لا ئەبەن هەر وەکـو گادەمـی ئاسـنگەر وەیا هەمبانەی ئاسنگەر ئاسنو زێـرو زیو خاوێن ئەکاتەوە وە پیسایەکـەی لا ئەبات ٠ وە حەجی مبرور جـەزای نی‌یە الا بەهەشت نەبی حـەجی مبرور واته قەبـول کراو ئـەم حەجەیە بـە پارەیەکی حەلاڵ بچـی وە « حـق الناس » یشی چوونه حەج جـێ بـە نجێ یکـەی یا بیدەیەوە یا ئیـزن لـە خاوەن حەق وەر بگری وەلـە ریگا هیچ کەس عاجز نەکەی وە هەر چـی گونەبی نەیکـەن چ بـە زوبـان چ بە کردەوە ٠

تەمای خــرابە لــە دڵ دەر بـــکا
لە هــەر گــوناهی زۆر حــەزەر بکا
غەللوو غەش نــەکا ئاخیر شـــەر نەبی
مەســرەفی حەجــی تــازەرەر نەبی
تابەمپاکییە لــە دنیــا دەرچی چــی
خودا نەسیب کا موسلمان هــەر چــی
بەڵکو حەج بکەین کــە حــەج بو تەمام
روو کەینــە شــاهی مەدینــە مەقام
خــۆڵی ژێری پێی بکەینــە چــاومان
فێنک کەینــەوە جــەرگو هــەناومان
جا بەمــل کەچــی لە رەوزەی رەســـول
بە چــاوی پــڕ ئاو دڵێکی مــەلوول
بیارینـــەوە هــەتا قــەبوول بین
بە لسوتقیخاسی بەلکو مەشمول بین

## (باسی فەرقی واجبو ئەرکانی حەج)

واجیاتی حــەج لە گــەل ئەرکانــی
فەرقیان بــۆت بــکەم تاکــو بیزانی
ئەوی واجبە بە خــوێن جــەبرە کــرێ
واتە ئەگەر چــوو فیدیەی بو ئــەدرێ
ئــەوی ڕوکــن بێ تۆڵــەی نادری
فیدیەو خــوێن ڕشتن جێگەی ناگــرێ
هــەر ڕوکنی بچی حــەج بەتال ئەکــا
پــارەو ئەزیەتت پایــە مــاڵ ئەکا

## (باسي ئەركاني حەج)

ڕوكنی حەج شەشن بە دڵێكی سەلیم
گـویٚ بگرە یەك یەك هەتا بـۆت بڵێم

ئەوەل ئیحرامـە لە گـەڵ نیـەت بی
پیٚخواس و سەر كۆت گەرچی ئەزیەت بی

جلكو لباسـی بەبـەن دروابـیٚ
مەیكە بـە بەرتـا ئەبیٚ هەروا بـیٚ

زەلیلو غـەریب ڕوو لـە خـوداكە
بۆ دەخالـەت ڕوو لـە بیت الله كـە

ئیشارەی ئیحـرام بۆ پیـاوی چـازان
گەرچی زاهـیرە بـۆت بكـەم بەیان

واتە هـەر وەكـو جلكی عـادەتی
لە بەر دائـەڕنی هەرچـی كەهـەیتی

ئەبـیٚ گوناهیش هـەمووی لا ببـا
هەنـدیٚ بە تۆبە هەنـدیٚ بە ئـەدا

بـۆ حقوقی خوا تۆبـەی خولاسـە
دانـەوەی لازم بـۆ «حـق الناس»

جا ئەم دانەوەش بـە هـەر تەرز بـیٚ
ئەدا یان عـەفووي صـاحب قەرز بیٚ

لباسـی تەقـووا بەبیٚ ڕیایـی
بیكە بە بەرتـا ئەگـەر پیـاوی

بەم جۆرە نەبی حەج قەبوول نابێ
قەصدی لەم حەجە ئەگەر خودا بێ

ئەگەر مەقصدی شتیکی ترە
نووسینی خودا بە گوێرەی فیکرە

حیکمەتی خودا ئاوێنە وارە
چی ئەکەی ئەوی لە ناو دیارە

روکنی دووەمین وەقفی عەرەفە
ئەوەڵی موودەی نیوەڕۆی عالفە

لە نیوڕۆی عالفە تا فەجری جێژنە
موددەی وقوفە ڕەحمەتە ڕێژنە

تەواف ئیفاضە روکنی سێیەمین
حەوت جار دەور دە تا رەحمەت برژێن

لە شەوی جێژنە نیوەی ئەخیری
ئەوەل وەقتیتی دیار نییە ئەخیری

ڕوکنی چوارەمین مەرواو سەفانە
غاردان لە بەینی سەفاو مەروانە

حەوت دەفعە برۆ لەم سەر تا ئەم سەر
ئەوەڵ سەفا بێ مەڕوە بێ ئاخیر
سەفا تا مەڕوە جاری یەکەمە
مەڕوە تا سەفا جاری دووەمە
چونو هاتنەوەت بە دوو حیسابە
حیکمەت وا لە لای (رب الارباب)ە

ڕوکنـی پێنجەمـین موو لا بـردنە
بـە تاشین یا خۆ بـە کورت کـردنە

ڕوکنـی شەشەمین زۆر بـە ئینتزام
تـەرتیب ڕاگـرە ئیتر والسـلام

## (باسی شروتی تەواف)

شروتی تەواف شـەشن ئیتر بـەس
یەکـەم پاکـژی لەپیسیو حـەدەس

دووەم بـزری لە بـۆ عـەورەتت
شـەرتی سـێیەمین بوونی نیـەتت

چارەمین ئەبـێ لە بەر دەکـەی ڕەش
دەس کەی بە تەواف بە دڵێکی بێ غەش

پێنجـەم ئەوەیە لـە وەختی تـەواف
کەعبە لای چەپ بی وایە بێ خیلاف

شەشەم لە شەرتان ئەمەیە حەفت جار
سوڕان لە دەوری ئـەم بەیتی نـازدا

## باسی واجباتی حەج

واجباتی حـەج پێنجـن یەقینـە
ئیحـرام لە میقـات ئەوەلەمینـە

دووەم مەبیتـە لـە موزدەلیفـە
مەبیتـی مینا سـێیەمی سـیرفە

مانایی مەبیت بۆت بەیان بکەم
بەشەو لەوێ بی جا زۆر بییاکەم

نیوەی ئەخیری لە شەوی جێژنە
بۆ موزدە لیفە یەقین تەعینە

سێ شەوی تەشریق لە بۆ مینایە
مەبیتی لێ کە شەرعەن وەهایە

تەوافی ویداع واجبی چارە
ڕەجمی شەیتانان پێنجەمە دیارە

شەیتانەکان سێن یەکیان عەقەبە
لە شەوی جێژنا ڕەجمی تەلەبە

نیوەی ئەخیری نەك نیوەی ئەوەل
شەرع داینــاوە دستور العمل

هەرسێ شەیتانان سیرۆژی تەشریق
هەر رۆژ پاش نیورو ڕەمیان کە تەحقیق

ڕەجمی هەر یەکیان ئەبێ حەفتحەفت بێ
ڕەجم بە بەرد کە دڵت ڕەحەت بی

سوپاس بۆ خودا ئەرکانی ئیسلام
بۆت بەیان کرا ئیتر والسلام

## باسی ئەرکانی ئیمان

جا بکەین باسی ئەرکانی ئیمان
باوەڕیان پێ کە بە دڵو بە گیان

ئەرکانی ئیمان چاوە کەم شەشن
کافرن هەر کەس لێیان بێ بەشن

یەکەم باوەڕی بە زاتی یەزدان
دووەم باوەری بە فریشتەکان

باوەڕ بەکتێبان سێیەمین ڕوکنە
لەلایەن خودا کە نازل بووینە

چارەم باوڕی بە پێغمبەران
هەموویان حەقن بێ شوبهەو گومان

پێنجەم باوەری بە ڕۆژی قیامەت
بو حیساباتی چاکەو خرابەت

شەشەم باوەڕی بە قەزاو قەدەر
فاعیلی موختار بۆ سودو زەرەر

ئیمان بە هەر یەك لە مانە نەیینی
یەقین کافرەو نامینێ دینی

یەك یەك بە درێژی بۆت بەیان ئەکەم
ئیمان قایم کە ئەی گییانە کەم

یەکەم باوەڕی بە بوونی خودا
ناوی (الله) یە لە عالەم جودا

خودامان یەکە تاکو تەنیایە
بێ وێنەو هاودەم هەم بێ هەمتایە

لە هەر شتێکی بێ ئیحتیاجە
عالەم هەموویان بە ئەو موحتاجە

ئەزەلی یانــی پێشــان هــەبووە
ئەبەدی نامــرێو قــەت نەمــردوە

سیفاتــی قەدیــم هەنە بــە ئیسپات
ئیرادەو قــودرەت کــەلامو حــەیات

سەمعو هەم بەسەر بـۆ خودا هــەیە
عیلمی شامیلە بۆ هــەر چــی هەیە

هیچ شتێ لە خوا قــەت بــزر نابــی
لای ئێمــە بزر یا ئاشــکرا بــی

دەنگی مێرولە لــە ژێر بــەر دو دار
یا گرمەی هــەوز لە فــەسلی بەهــار

هەر وەکــو یەکن بۆ جــەنابی حــەق
هەر دووك بێ فەرقن لای زاتی مطلق

هەرچی دەبینی لــە ئــەرزو ســەما
حــەیوانو مەعــدەن نەباتو گیــا

هەم مانگو هەم رۆژ لە گەل ستارە
هەرچــی لە دنیا بــە چــاو دیارە

عالەمــی مولکــە مولکی خــودایە
پێشان نە بوویــە خــودا دانیایــە

جینو شەیاتین ئەرواحــی قــودسی
قسمی مەلەکوت چی لێی ئەپــرسی

هیچیان نە بوویــە خــودا دانیــاون
بە ( حدوث ) و ئیمکان پەتك کــراون

ئەوی واجــب بی دائیم هــەر هــەبی
هەر خــودایە بــەس عەقلت قایــم بی

خــەوو خــواردن بۆرژانو نــوستن
هەلسانــو ڕۆیــن یا خــۆ دانیشتن

بۆ خــودا نابــن گشتیان مــەحالن
ســیفاتی جیسمن دوور لە کــەمالن

هیــچ جێگای نی‌یەو لــە جێگا دوورە
مونەزەهــو پاك هەر بەم دەســتوورە

لــە هــەر جێگایێ عیلمی حــازرە
لە سەر کردەوە بــە خــۆی (ناظــرە)

چ عەرش‌و چ فــەرش بو خــودا یەکە
ئاسمان‌و ڕێسمان هــەر وەکو یەکــە

## (باسی ڕوکنی دووەم لە ئیمان)

ڕوکنــی دووەمین لــە ڕوکنی ئیمــان
ئیمــان بە بــوونی ملائیکەتــان

فریشتــە هەنــە خەلقی خــودانە
وەسیلەی بەینــی خەلّقــو خــودانە

ئەویش مەخلووقــن هەر وەکــو ئێمە
ئەمما موتیعــن نــەك وەکــو ئێمە

قوووەی نەفســانی بۆ ئــەوان نی‌یە
بۆیە مەعصــومن گوناهیــان نــی‌یە

ژیر دەستی نووسەر پێ نوس چلۆنە
ئەوانیش بۆ خوا هەر بەم چلۆنە

بێ ئیختیارن چۆن خوا ئەمر کا
هەر وا ئەکەن ئەو بێ ئەمری قاکا

ڕوحی خولاسە بەری لە نەفسن
بێ بابو مندال بێ خزمو کەسن

خواردنو خواردنەوە بۆ ئەوان نی یە
بۆرژانو نووستن لای ئەوان نی یە

هەر یەك بە ئیشێك مەشغولی کارن
مطیعی ئەمری پەروەردیگارن

چواریان موقەڕەب جبریل میکائیل
ئی دیش ئیسرافیل ئەو جا عیزرائیل

ژماریان نۆزدە زێدەو کەم نی یە
بە نەسی ئایەت ناو زەبانیە(١)

ناوی مالکە سەرۆکی ئەوان
دۆزەخ دەورەدا بە یەك چاو قوچان

هەندێ فریشتە هەلگری عەرشن
ناوی ئەمانە حەمەلەی عەرشن

---

(١) ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرموی ( علیها تسعة عشر ) سورة لمدثر اية ٣٠ وا٦ە بۆ ئیشو کاری جەهەننەم نۆزدە فریشتە دانراون وە هەر یەکیان ئیشێکیان پێ سپێراون •

ئیستاکە چوارن ئەمما لە قیامەت
ئەبنە هەشت عەدد بە نەسی ئایەت(٢)

حەمەلە یانی شتێ هەلگرێ
عەقلو بیری مە لەوە نا بڕی

ئێمە نازانین کە عەرش چۆنە
یا هەلگرتنی ئەم عەرشە چۆنە

پێویستە ئێمە باوڕی پێ بکەین
خەیالو بیری هەرگیز لێ نە کەین

لەو بەحرە قۆلە ئێمە دەر ناکەین
تەوانان نی یە ئێمە تێ ناگەین

بیر کردن لە خوا هۆیی هیلاکە
بیری لێ مەکە هەر وەها چاکە

گەر ڕۆژ نەبینی شەمشەمە کوێر
عەیبی خۆیەتی با نەبی زوێر

---

(١) لە تەفسیری (بیضاوی) دا ئەفەرموی (روی مرفوعا انهم اليوم اربعة فاذا كان يوم القيامة امدهم الله باربعة آخرين ) واتە ریوایەت کراوە لە پێغمبەر (د•خ) کە فەرمو یەنی ئەمانە ئیستا لە دنیادا چوارن بەلام لە قیامەتدا خودای گەورە بە هێزیان ئەکات بە چواری تر •

(٢)ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرموی ( ويحمل عرش ربك فوقهم يومئذ ثمانية ) سورة الحاقة الاية ١٧ •

واتە هەڵ ئەگری عەرشی خوای تۆ لە سەرەوەی عالەمو مەلائیکە هەشت ژمارە یا هەشت مەلائیکە یا هەشت تاقمە •

ئێمە نــازانین کــارەبا چــی‌یە
جا چــۆن ئەزانین کــە (الله) چــی‌یە
سەرمــان بڕ ناکا لە خــواو ســیفاتی
لــە چلونی‌و چــۆنی لە کارەســاتی
کەسێ کەر نــەبی ئەڵێ خــوا هــەیە
لە خــوا بیر ناکا چــون قەدەغــەیە(١)
بەهۆیی حــەواس ئێمــە دەزانــین
بە غەیری حــواس چیــدی نا توانین
جیسیش بــڕ ناکا لە زاتــی موتلەق
خــۆت ماندوو مەکە مەکە چەقە چەق
مەگەر شێت ئەبی عــەقلت نامینــی
ســەرت گێژ ئــەبی خێرت نامینــی
بۆئیمان بە خــوا بــاوڕی ژنانــە
ســەری گشتی‌یەتی باشــی بزانە(٢)
لۆ چــی‌و لە بەر چــی لەوە دا نیــە
خواماں وەك هیچ شت چ وێنەی نیــە

(١) ئەڕوانی بۆ ئەم فەرمایشی پێغەمبەر کە فەرموویەتی ( تفکروا فی خلق الله ولا تفکروا فی الله فتهلکوا)٠

واتە : بیر لە خەلقی خوا بکەن کە دروستی کردووە بەڵام بیر لە خوا مەکەن مەگەر بە هیلاك ئەچن ٠

(٢) ئەڕوانی بۆ ئەم فەرمایشی پێغەمبەر کە ئەفەرموێ ٠

( علیکم بدین العجائز فأنه مــن أسنی الوجائز ) واتە : لە ســەرتان بێ بە وینی پیرەژنانە چونکە لە هەموو هۆیەکی نەجات چاترە ٠

تۆی هینا دونیا ئـەو دەت باتـە دەر
بیر لە چی ئەکەی بەندەی قوڕ بە سەر
لە دەستت نەبو هاتیـە دونیـا
بە خۆش نازانی عومرت چۆن ئەڕوا
چـونە دەریشت لە دەست خـۆ نیـە
قـوناغی ئاخـیر نازانی چـی‌یە
کردەوەت باشـە زۆر بـە ئیمانـی
دەچی بۆ بەهەشـت باغو بوسـتانی
مەگەر ڕو ڕەشـی دەچـی بۆ ئاگـر
ئاگری جـەهەننەم گـوڕیو خـەراتر
هەنـدێ حەفەزە لە سـەر موخلوقە
لە بەر وان نەبـی ئیشمان شلۆقـە
حـەفەزە یانـی پارێـزەرت بی
بۆ دەفعـی بـەلا دەورو بـەرت بی
گەر خوا ئەمانەی بـۆ دانـەنا بـای
چۆن ئەکرا بـژی تەمەن بە سەربەی
لەشکری پێشکە گەر بێتـە سـەرت
خۆت پێ پاس ناکرێ هەی قوڕ بەسەرت
مێشـولە گـەر بێ دەورت لێ بـدا
کێ نەجاتتـەدا بە غەیـری خـودا
مارو دویشـك گـەر ئیزن بـدرێ
بە کـاتێکی کـەم لاشـەت دە دڕێ
مێسترو باڵرگیر یا خـۆ گـوێ درێژ
بە یەك پێ لەقە دەت کەن سەرەو لێژ
نەسخیری ئەسپ گەر لای خوا نەبێ

کێ ئەتوانێ بێ وەها سواری بی
چێرۆکو گاجوت گەر سەرت کەون
پانتە کەنەوە وەك پەڕۆی کەون
مێرولەو مەگەز زەرگەت زەنگە سۆر
وات بە سەر دینی نە گەیەوە ژۆر
جینن‌و شەیاتین هێرشێك بینن
نە هۆش نە عەقل لە لات نامینن
خودای تەعالا بۆ پاریزی شت
هێزی داناوە لە پێش‌و لە پشت(١)
ئاگادار نینە ئێمە غافلین
کە خوا چی ئەکا تا ئێمە بژین
کائناتی کرد بە خزمەت کارت
تاتو نان بخۆی بسوڕێ کارت
ئەتۆش غافلی شوکرانە ناکەی
بەندە بوچی وا بیر لە ژین ناکەی
وا دەزانی خۆت ئیش دەسوڕێنی
زۆر سەیری گیانە مەکە هورێنی
هەموی خوا دەیکا تۆ هەبی‌و نەبی
هەروا دەسوڕێ تا دونیا هەبی

---

(١) ئەروانێ بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرمووی ( لە معقبات من بين يديه ومن خلفه يحفظونه من أمر الله )سورة الرعد الاية (١١) •

واتە لە بۆ خوا هەنە ئەو مەلائیکە تانە کە لە دوایی ئینسانن لە پێش‌و لە پاش ئەیپارێزن لە هەر تەنگو چەلەمەیەك وە ئەو مەلائیکە تانەش لە تەرف خوانە •

(دانەر)

ئەجەلی دنیاش کاتێکی کە هات
هەمووی تێك دەچی نیزامی دونیات
هەندێ کاتبن بۆ هەر چی بکرێ
هەرچی کرا ئەو مسوەددەی ئەگرێ
یەکیان عەتیدە لە سەر شانی ڕاست
چاکە ئەنووسێ بێ مەحوو ئیثبات
یەکیان لای چەپە ناوی رەقیبە
لە سەر هەر گوناە ئەو یان رەقیبە
هەمووی ئەنوسێ بە بێ زێدە وکەم
هەر چی گوناە بێ عائدە بە ئەم
دەفتەر ئەنوسنی بە رۆژو بە شەو
بە قەد سەری موو سەهوو ناکەن ئەو
ئیشمان گرنگە ئێمەش غافلین
بارمان گرانە ئەگەر عاقلین
لە پازدە سالی تا وەکو مرون
دەفتەری ئەعمال لە سەرمان دەگرن
لە وەقتی مردن دەفتەر دەپێچن
لە ملی مەییت ئەوجا دەپێچن(١)

---

(١) ئەم شیعرە ئەڕوانی بۆ ئەم ئەیەتە ( وکل انسان الزمناه طائره في عنقه ونخرج له یوم القیامة کتابا یلقاه منشورا أقرا کتابك کفی بنفسك الیوم علیك حسیبا ) سورة الاسراء الایة (١٣ـ١٤) ۰

واتە هەر ئادمیزادێك ئێمە لە ئەستۆرەی ویمان پێچایە عەمەلی ولێ وە کتێبی عەمەلی وە رۆژی قیامەت دەینینە دەرلی لە بۆی کتێبەك کە دەیکاتێ بە لێك کراوەیی وە خودای تعالی پێی ئەفەرمووی نتێبو عەمەلی خۆت بە خۆت بخوێنەوە وە وە کافی‌یە بە نەفسی خۆت ئەم رۆ حسناب لە گەل خۆت بکەی تانەلێی کەس زولمی لێ کردیمە ۰

تا رۆژی قیامەت خودای وەهاب
بە گوێرەی دەفتەر دەکاتن حساب
دەفەرمووی بە خۆت دەفتەر بخوێنە
تا نە لێی خودا زولمی کردینە
هەر بە خۆت زولمت لە خۆ کردووە
ئەو ڕۆت لە دونیا لە بیر کردووە
گەر ئینکاریش کەی خودای تعالی
زارت مۆر ئەکا ئەلێتە ئەعزا
ئێوە شاهد بن کە چی کردووە
لە دونیای فانی هەتا مردووە
ئەو جا ئەعزا کان یەك یەك هەموویان
شاهدی ئەدەن دەست ئەکەن بە قسان
کابرا ئەلێتن بۆ شاهیدیو دا
خۆ هەر ئێوەنە ئەبن بەر بەلا
ئەوانیش دەلێن لە دەست خۆن نەبو
ئەمریکی خوایی کن فیکون بو
ئێمەی وا لێ کرد قسەی پێ کردین
کە جیت کردووە وە چیت پێ کردین(١)

---

(٢) ئەروانی بۆ ئەم ئایەتە ( الیوم نختم علی افواههم وتکلمنا ایدیهم وتشهد ارجلهم بما کانوا یکسبون ) سورة یس الایة (٦٥) ·
واتە لەو ڕۆژە کە عالەم ئەچیتە جەمەنەم خودای تەعالا ئەفەرمووی ئەورۆ ئێمە زاریان مۆر ئەکەین وە دەستە کانیان قسە لە گەل ئێمە ئەکەن وە پێیە کانیان شاهدی ئەدەن بەو شتانەی کە لە دونیا کردویانە ·

گەر ئەمر بکا خودای بە حیکمەت
شت دێنیتە قسە بە مەحزی قودرەت

خودا رەحم کا چاکەت زیاد بی
جێگەت بە هەشتە یا خوا زیاد بی

ئەگەر خرابەت لە چاکە زیادە
جێگەت ئاگرە حاڵت بەر بادە

هەندێ مەلائك لە بۆ سوئالن
لە ناو گۆڕ ئەکەن پرسیاری حالن

یەکیان نەکیرە ئەویتر مونکەر
لە گۆر ئەپرسن لە هەموو بەشەر

کێت پەرستووە بە خودایەتی
کێت دیار کردبوو بۆ عیبادەتی

نەفسی خۆت یاخۆ خودای ئەکبەر بوو
هەم بۆ دینیشت کێ پێغەمبەر بوو

ئەخلاقو عادەت ئایینت چ بوو
عەقیدەو مەزهەب هەم دینت چ بوو

---

(١) ئەڕوانی بۆ ئەم ئایەتە ( قالو لم شهدتم علينا قالوا انطقنا الله الذى انطق كل شىء ) سورة فصلت الاية ٢١ .

واتە کافرەکان ئەندامەکانیان دەڵێن بۆچ شاهیدیتان دا لە دژی ئێمە ئەندامەکان دەڵێن ئیمەی بەقسە هینا ئەو خودایەی کە هەموو شتیك وەقسە دەینی پیشان .

تێبینی پیشان ئەوە هەر بە بوو بەڵام ئیستا بە خۆمان دەبینن کە خودای تعالی هەموو شت بە قسە دینی وەکو شریتی تەسجیل قەوانی گرام فلیمی سینەما ئەمانە دەلیلن بۆ ئەم ئایەتە .

ئەگەر لـــە دونیا ئیتاعــەت بووبــێ
بە ئەمری شــەرعی ڕەفتــارت بووبێ
زبانتە گــەڕێ بێ ترســو ئــەلەم
وەڵامــت ئەدەی یــە موددیکی کــەم
دەڵێی خودای مــن زاتــی الله بوو
پێغەمبەر ریشــم رســول الله بــوو
ئایین‌و دینم دینــی ئیســلام بــوو
هەرچی موسلمان خوشــکو برام بوو
بەڵێ کەعبە بــوو قیبلەی نوێژەکــان
هەم پێشەوام بوو ڕێ ڕۆنی قــورئان
جا بە خێر هاتنی زۆر چاکت ئەکــەن
دووریش لە بــەڵاو هیلاکت ئەکــەن
ڕوحە کــەت ئەبەن زۆر بــە ئیحترام
بۆ جــێی ئیمان دار لــە دار السلام
ئەگەر لــە دنیــاش دینــت نەبوو بی
ئایینی ئیسلام ڕێگەت نــە بــوو بی
یا باوڕیت بە پیغەمبــەر نە بــوو بی
شەرعی ئەحمەدت ڕەهبەر نە بــووبی
زبانتە گــیرێ لە تــرسی ئــەوان
موعەتتــەل ئــەبی لە بــۆ وەڵام دان
قەبرت تەنگ ئــەبی ئەبێتە زینــدان
خۆڵۆ هەوا کــەش ئەبێت بە نیران(١)
ڕوحەکــەت ئەبەن لە بۆ ناو ئاگــر
عــەزاب ئەچێژی تــا ڕوژی ئاخــیر

ئەویش لێت ئەدەن بە گورزی ئاگــر
عەزابت ئــەدەن یەك لە یەك چــاکتر
جا ئەم عــەزابە هــەروا دەمینــی
تا فریشتەی خــوا عەفووی بۆ دینــی
خــودا بە لوتفت بمــان پارێــزە
بۆ خاتری ئەو کــەس کــەلات عەزیزە
ببەخشــە عومەر لە هــەر عەزابێ
لە دونیــاو قیامــەت لە هــەر عقابێ

## (باسی ڕوکنی سێیەم لە ئیمان)

لە ڕوکنی ئیمان ڕوکنی ســێ یەمین
ئیمــان بــە کتێب با بــە دڵ بینین
سەدو چوار کتێب لای خودای ئەکبەر
هاتینــە خــوار بۆ تەعلیمی بەشــەر
چــواریان کوتبن باقــی سوحــوفن
هەمووی پڕ حیکمەت ئاوێنە ی لوتفن
سەد سوحوف هاتن لای خودای عالەم
دە نــازل بووینــە بۆ بابە ئــادەم
پەنجا لە بۆ شیت زاتــی بە تەبجیــل
دە بۆ حــەزرەتی ئیبراهیم خەلیــــل
سیش لەبۆ ئیدریس زاتی منــەووەر
هەمووی بەس لە بۆ هیدایەی بەشەر

چوار کتب هاتین لای خودای رەحمان
تـەوراتو زەبوور ئینجیلو قورئان

تەورات بۆ موسی بۆ حوکمو ئەحکام
لە سـەر ویو محمد برژێتن سەلام

زەبور بۆ داوود نـەوەك بۆ ئەحکام
بەلکو بۆ زیکری ( حي لا ینـام )

حوکمو ئەحکامی هەر بە تەورات بوو
وارثی مـوسی بۆ تـەبلیغـات بوو

وەك پێغەمبەری بەنی ئسرائیـل
حوکمی تەورات بوو تا هاتنی ئینجیل

کە هاتە خـواریٚ بۆ عیسی ئینجیل
تەورات نەسخ بوو بە ئەمری جەلیل

عەمەل بە ئینجیل ئەمری ( ذو الجلال )
بە غەیری ئینجیل عەمـەل بو بەتاڵ

دنیا نۆبەتە نۆبـەت تا ئیسـتا
لە بۆ ئیسحاق بوو ئەوجا راوەسـتا

چونکە ئیرادەی مـەولایی جـەلیل
نۆبەی هیٚ خستە نەسلی ئیسماعیل

جێگەی نبووە جاکـەوتە فاران
ئیەلای محمد گـەورەی ئینسو جان

خـەڵات کـرا جا قورئانی بۆ هات
چـرا لابـبـە چونکە رۆژ هەڵا

نەسخ بوو حـوكمی كتێبی پێشی
به ڕۆژ ئەسـتێره چۆن دەكا ئیشی

جا رۆژی قـــورئان هەتا تلـوع كا
عالــەم شۆق داری ئەسلو فروع كا

دنیا مەعمـــوره بەشـــەر ڕحـــەته
هــەر كەس له ژیانا دوور له خەفەته

هەر كەس به قورئان ڕەفتار نەكاتن
خۆی زەرەر مەندی دوو دار ئـەكاتن

له داری دنیـا قەت رحـــەت نا بی
له داری عوقباش جێی بەهەشت نا بی

ڕێ ڕۆنی حەسره بەس له قـــورئانا
هەر كەس پێی نەكا عەمەل نەزانــه

ڕێگەی نەجاحه بۆ هــــەر بەشـــەرێ
هەر كەس لێی لادا قوڕ به سەر ئەمرێ

قانونی هەر كەس یاسای بەشـــەره
هۆی دەرباز بوونی دنیاو ئەو ســـەره

قانونێكی چاك بێ فـــەرقو تـــەمیز
حوكمی یەكسانــه بۆ پەستو عەزیز

حـــوكمو ئـــەحكامی بۆ ڕەشو سپی
بۆ هــەر نەتەوه وەك یەك ئەچەسپێ

بەچكەی پێغەمبـــەر گـــەر دزی بكا
ئـــەبڕێتن دەستی جیـاوازی ناكا

هەر کـەس بکوژی ئـــەبێ بکوژرێ
گچکە یا گەورە کەس جـــەب نادرێ

ڕێی زوڵم نادا بـــە هیچ تـەبـەقە
ڕێی فەساد نادا بە هیچ فەســـەقە

بەم حاڵە ئیســـــلام کـــەتە تەڕەقی
بڵاو بو هەروەك خورشـیدو شەوقی

هـــەر لە هیندستان تا دەگاتە چین
لە ترسی ئیسلام هـــەموو دەلەرزین

لە ئەندونیسیا تا جـــــەبەل تاریق
هەمووی بۆ ئیســـلام بوونە موافیق

هەر لە ڕۆژ هەلات تاکـــو ڕۆژ ئاوا
لە شەرقی ئەدنا تا شەر قی ئەقسـا

کەتنە دەست ئیسلام لە بەر عەدالەت
ئایینیان وەرگـرت بـە بێ خیانـەت

قەیسەری ڕۆم‌و کیسرایی عەجـــەم
هەمووی بەر باد کرد بە موددێکی کەم

قانونی ئیسلام تاکـو قـورئان بـوو
شاهەنشای هەموو کەونو مەکان بوو

یەك ڕو یەك جیهــەت شاهی میلەل بو
سەر بەرزو حوڕ بو دوور لە خەلەل بوو

عەمەل بە قـورئان چـونکە نەمایــە
بزانـــە ئیســـلام چی لێ قەومایـە

عالەم کەوتە دوو ئـەغرازی شەخصی
هیچ کـەس لـە دینی ئیستا نا پرسی
بەشیٚ موبتەلای عارەق و قـومار
بیٚ ترس لە خـوای واحدو قەهــار
لای خۆشی وایـە ئـەوە ئەشـرافە
حاشـا وەکـەللا درۆو خیـلافە
ئەشراف ئـەوەیە غیرەتی هـەبی
لە سەر دینی خۆی سوباتی هـەبی
نەوەك وەك پـەلاش بـە تۆزە باییٚ
لە جیٚ هـە رقەنیٚ بکا سـەماییٚ
سەر روت و لاق روت ئیستە چی ئەکا
ئـەوە کەی دینـە ئەستەغفروالله
مەلهـاو مەلعەبە لە گـەل سینەما
وای لە ئیسلام کرد هۆشیان لا نـەما
ترسی مردن و حەشـرو قیامـەت
نایێتە دڵیان خـەیال ناکەن قـەت
دینیان نەمایە وەهەم دونیا کەش
بیٚ فایدە ئـەڕوا بە بیٚ کەشا کـەش
ئێمـە گۆڕایین بۆیە لێن گـۆڕا
تا تۆ نە گۆڕیٚی نایگـوریٚ خـودا[1]

---

(١) ئەروانی بـۆ ئـەم ئایەتـە (ان الله لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم سورة الرعد الآیة (١١) •

واتە خوا ناگـۆریٚ لـە هیـچ قەومێك وە ئەو نازو نیعمەتـەی پێی داون لێیان ناستێنیتەوە هەتا ئەوان دڵیان نە گوڕیٚ کە ئەوان دڵیان گۆڕا خوای گەورەش نیعمەتەکەیان لـیٚ دەستێنیتەوە • ( دانەر )

جا ئەغلەبیـــان بە گەنجی ئەمــری
یا مەرمق دەیبـا یا وەرەم دەگـــری

قورئان دەفەرمووی هەرکەس واز بینی
لـــە دین‌و قـــورئان بکـا بێ دینی

بە ژینێکی تەنگ دونیـــا ڕابێری
لە قیامەت حەشری دەکرێ بە کوێری(١)

هەر وەکو گوتمان ژینی تەنگ وایە
حەقیقەت مەعلووم فەرمودەی خوایە

ئینسان بـە دین بی گەرچی فەقیر بی
بە زاهیر پەڕپوت فەرشی حـەسیر بی

ئـــەمما ناو دڵی وەکو ســـەحرایە
بێ غەم‌و خەفەت هەر وەکو شـــایە

خوڵاسە قورئان ڕێگەی ســـەلامەت
بۆ دنیا‌و قەبر حەشـــرو قیامـەت

دەستی تێ بگری دەتباتـە جینـــان
دەستی لێ بە ردەی دەتخاتـە نـیران

باسی روکنی چوارەمین ئیمان بە پێغەمبەران

---

(١) ئەروانی بۆ ئـەم ئایەتە (ان الله لایغیر ما بقـــوم حتـــی یغیرا بچی‌بەجی بو ووتەی عەزاب لە ســەر گاورەکان ئــەو جـــا لە لایـــەن خەیوتەیدا‌وەکیـــان پیپیان ئەوتـــری لە بیر نەئەکرد ئەیان پەرست وە هەر وەها بێ ئەمریان نە ئەکرد وەئیمانیان

روکنی چارەمین ئیمـــان بە روســــل
لازمـــــە بینین بــــە روحو بــە دڵ

سەدو بیست هەزار لە گەل چار هەزار
ئەنبیـــاو مورسل بە عەدو ژمـــار

هەموویان حەقن عەبدی خـــودانە
جینو مەلك نین نەوعی ئینســـانە

هەموو پیاون لــە نەوعی بەشـــەر
ژن لە کەم عەقلی نابێتە رەهبـــەر(۱)

پاكو مەعصومن دوور لە گـــوناهن
ئەمینی دینو وەحیی ئیــــلاهـن

هەموو زیرەكو راست گۆو ئـــەمینن
پاکیان بۆ تەبلیـــغ تونـــدو بــە تینن

هەر سنعەتێکی کە بەشــــەر هەیتی
لە پێغەمبـــەران بووە نــەشئەتی

هەمـــــووی بە وەحیی لە لای خوداوە
هەر ئیشی بە یەك تــەبلیغ کـــراوە

فەلاحیو چانـــدن بۆ ئادەمو شیس
خـــەیاتیو دروین عائید بە ئیدریس

---

سورة يوسف الاية ۱۰۹

(۱) ئــەروانی بۆ ئــەم ئایەتــە ( ومــا أرسلناك مــن قبلك الا رجـالا نوحی الیهم ) واتــە نەمــان ناردووە پێشی تۆ تەنها پیاو نەبن ئەوا وەحییان بۆ ناردن •

سەفینەو پاپۆر ئەعمـالی بەحـری
عائد بـە نوح بوو ئەوەلی ئەمـری
عەمـەلی ئاسـن ئالاتی حـەربی
ئیشی داود بوو بـە ئـەمری رەببی
ئیشی هـەوایی کاری تـەیارە
سولەیمان داینا لە ئـەوەل جارە
عەرشی سـولەیمان یانی تـەیارەی
دوو مانگ دەڕۆیی سبەو ئێوارەی
دەقی ئایـەتە ( غـدوها شـهر )
( رواحها شـهر ) قەولی منەووەی
بناو غەوواسی ئـەنواعی حیکمـەت
ئیخراجی مەعـدەن بۆ کلی سنعەت
هەموو سولەیمان پەیای کردینـە
وەحی خودانە هـەم سەماوینـە
( ذو القرنین ) بوو ئوستادی ئـەوەل
بە ئەمری خـودا خستیە عەمـەل
قەتار ترومبیـل ئـەبی بـە غار بی
بو ڕێگا برین بەشـەر سـوار بی
زولمەتو هەم نوور قـووەی کارەبا
ئەو پەیای کردن بە ئەمری خـودا
( وأتینـاه مـن کل شیئ )
( سبباً ) ئـەدا خـەبەر بە هـەیین
زۆر لە سنعەتان پێشان هـەبووینە
هەتا ئیستاکە پـەیدا نە بووینـە

یەك جـــەنبی مادده لە جێگایی دوور
کەس نەیکردی‌یە هێشتا بەهیچ‌جۆر
هەر وەکو ئاسەف بە یەك چاو قوچان
تەختی هێنایـە بۆ لای سولەیمـــان
تەختی بەلقیسا مـەلیکەی یەمـــەن
هێنایە قدسیّ بە یـەك چاو زەدەن(١)

(١) ئـەڕوای بـۆ ئـەم ئایەتە( قال الذی عنده علم من الکتاب أنـا أتیك به قبل ان یرتد الیك طرفك فلما رآه مستقرا عنده قال هذا من فضـل ربی ) سورة النمل الایة ٤٠

واتە کورتەی ووتە کـە ئەمەیە کە سـولەیمان کاغـەزی نـارد بـۆ بەلقیس کـە بێتـە لابـی بۆ ئیسـلام بوون بە ئەهلی مەجلسی گوت کێ عەرشیّ بەلقیسم بۆ دێنی پێش ئـەوە کە بەلقیس بگا تە تێرە • یەك لـە عیفریتە ئەجندەکان ووتی من بـۆت دەهێنم پێش ئەوەی کە لە جێی خۆت هەلستی بۆ نیوەڕۆ بچیـە وە مـاڵ ، فەرمووی ئەمەویّ زووتر بیهێنن ئەوجا یەکێك لەو کەسەی کە عیلمێکی باشی هەبوو ووتی ئەمن بۆت دەهێنـم پێش ئەوەی کە چاوت لە جێگەیەك بکەیوو جێ بەجێ بگەڕێنیەوە واتـە ، بەیەك چاو قوچان سولەیمان ڕوانی بۆ دەرێ کە چاوی لە تەنیشت خۆی کرد دیتی تەختە کە حازرە وسولەیمان فەرمووی ئەوە لە گەورەیتی خوای خۆمە کـە ئەم سەلتەنەتەی پێ داوم •

تێبینی ئەگەر کەسێ بلی ئەمە بە موعجیزە بووە وەلامی ئەدەینـەوە ئەگەر موعجیزە بووایە سـولەیمان خۆی تەختەکەی ئەهێنا چونکە ئـەو پێغەمبـەر بـووە وەموعجیزەش بـوو پێغەمبەرانە موحتاج نەدەبو بە ئـەهلی مەجلس بلێ • دیارە بە موعجیزە نـە بووە بە عیلم بووە هەر وەك خـودا دەفەرموی ( وقال الذی عنده علم مـن الکتاب ) صدق الله العظیم •

دانەر

یەکێك ئەمەیە بە عیلمی حیکمەت
دروستیان دەکرد ئەهلی سەلتەنەت

ناویان لێ نا بو تەلای دەستە فشار
لە ماددەی زێری وەك شەمامەی کار

لەناو دەست ئەنرا کەڕا دە گوشرا
زێر دەهاتە دەر بە مەقەس دەبڕا

ئەوی لێی دەبڕا دەیان فرۆشی
دەیان دا بەشت بۆ گەلو خۆشی

دووبارە ئەگەر پێویستیان بایە
دەیان گوشیەوە بەبێ نیهایە

لە گەڵ ئەوەشدا کەمی نە دەکرد
ئیشیان دەسوڕا زۆر بە دەستو برد

یەکیش ئەمە بوو بۆ دیتنی هەر لا
دروستیان دەکرد لە بۆ تەماشا

ئەوی‌دی جامی جیهان نوما بوو
چار قوڕنەی دنیای تێدا دیار بوو

ڕادارێکی عام بۆ هەموو دنیا
نومایشیە کرد هەر چی کە هاتبا

ڕادار ئەوێستا حەقیقەت هەیە
ئەمما لە گەل پێش زۆر فەرقی هەیە

یەکیش ئەمە بوو لەشکری دوشمن
کە داتە سەریان دەیان کرد یەك فەن

هێزی موغناتیس دەیبردنە هــــەوا
ڕایان دەگــرتن لە ناوەند هــــەوا

هەر بە ئــــەم نەوعە هــەتا دەمردن
دەیان خستنە خوار لە پاشی مــــردن

زولمــەتو نوور بوون یەك لە سنعەتان
لە وەقتی شەڕدا ئیشیان پێ دەكران

لەشكری دوشمن لە ناو ڕووناكی
لەشكری خۆشیان لــە ناو تاریكی

ئــــەوەی تاریكی ئەیدی ناو ڕووناك
بە كەیفی خۆیان دەیان كوشت بێ باك

ئەوەی ڕووناكی نایـــدی ناو تاریك
بەچەجۆر ناكرا بەشەڕ بن خــــەریك

دەڵێن ئــــەوانە هـــــەموو هەبووینە
خودا دەزانی ئاخوو چــۆن بووینـــــە

هەندێ لەمانە ئەسكەندەر نامـــە
باسیان دەكاتن بە نووكی خامــــە

لــــە پێشینانم وەها بیستوونــە
نازانــم ڕاســـتن یا خـــۆ درۆنــە

لە ئەنبییایان ئــەوی ( أفضـــــل )بی
سێ سەدو سێزدەن ئەوی مرسل بی

بە قەد (لفظی) جەیش بە گوێرەی ئەبجەد
ئەون لە شكری پادشایی ســــەمەد

لەم سێزدەو سێ سەت پێنجیان بە تەحقیق
گەورەی هەمانن پێیان کە تەصدیق

( اولو العزم )ن ئــەو زاتــە گەورانە
تاجی رەئیسی وا لە ســــەریانــە

نــوحو ئیبراهیم موســـاو عیسی
پێغەمبەری خـــۆن حضرتی تاهــا

تاجی هەموویان شاهم ئەحمـــەدە
رەئیس ئەرکانی جــەیشی ئەحـــەدە

لە شـــاری مەکە نە دایکی خوی بوو
لــە مەدینەش دا وەفاتی فەرمـــوو

بابی عەبــدوللا دایکــی ئامینـــە
ڕەوشت جوانو خــولق شـــیرینە

وەقتی دوو مانگی کەلە زگ دا بوو
عەبدوللای باوکی وەفاتی فەرمـــوو

عومری شەش ساڵە زور زور منال بوو
ئامینەی دایکی کە بە رەحمەت چـوو

نەشئەتی فەرموو ئـــەو زاتی وا پاك
بێ ماڵو فەقــیر بێ بابو بــێ داك

هیچ کەسێ نە بوو کە غەمخواری بێ
بۆ دەئبوو ڕەوشت تەرتیبداری بوو بــی

بە غەیری خودا هیچ کەسێ نــە بوو
تەرتیبداری بی لە ڕەوشتو خــوو

نە خوێندەوارو شــەخسی ئومیی بوو
بێ خەتوو نووسین هەروا قەومی بوو

بەم جۆرە ڕاپبارد تا بوو بە چل ساڵ
جا خـــەلات کرا لە لای ذو الجـــلال

روتبەی نبووەت لە بــەری کـــرا
تاجی رســـالەت لە ســـــەری نرا

لە غاری حیرا جـوبریل هاتە خـــوار
(اقرا باسم رب)پێی گو ئەوەل جـار

پێغەمبەر فەرمووی من خوێندەوار نیم
ئەگەر نا ئەمن گـوێ لێ نـــەگر نیم

دوو بارە فەرمووی ( أقرأ ) بخوێنـــە
دوو بارە فەرمووی خوێندەوار نیمـــە

فەرمووی سێیەم جار بە (خير الخلق)
( أقـــرا باسم ربك الـــذي خلق )

جبریل لە جاری دووەمـــو سێیەم
دەیگرتە باوەش بە دەردو حەشـــــەم

ئەزیەتی ئـــەدا پەیغەمبەری خـــوا
تا حـــازر ببێ بۆ وەحیی خـــــودا

جا جاری سێیەم خوێندی پێغەمبـــەر
لە دوای جبریلی دەیخوێند هەتا سەر

دڵی وای لێ هات وەحی وەرگـــری
بۆ کـــەلامی خوا بۆ بـــە موشتەری

عیلمی سابقین ئەخبــاری غەیبی
هەمووی پــەیا بوون بەئەمری رەبی
بوە مەعدەنی عیلمو تەرتیبـــات
بۆ نآسینی خوا رەئیس تەشریفـات
( أیهـا المـدثر ) جا ( قم فأنـــذر )
تەبلیغی دین کــە مـــەویستە چیتر
ئەویش دەستی کرد بە تەبلیغی دین
لە سەر ئەمری خوا بە عەزمی مەتین
جا خزمو کـــەسی بو نـــە دوژمنی
هەمووی زۆر تیژ بوون لە بۆ کۆشتنی
لە سەر ئەم حالەش غایەت فەقیر بوو
بێ ماڵو موعین هەم بێ نەسیر بـوو
بەس خەدیجــە بوو بی تەپاڵ پشتی
بە ماڵو بە ســـەر بە هەموو چشتی
لە گەل ئەم حالە ش لە کەس نا ترسا
تەبلیغاتیە کـــرد بێ ترسو پــەروا
بـــەم حالە دیارە ئـــەم زاتە پاکــە
پێغەمبەر بووە نە ک ئەم ئیدراکـــە
ئەم یاسا جـــوانە لە ناو قورئانـــە
کە عالەم هەمووی تێدا حـــەیرانـە

بێ خینـــدنو کەســب بێ موعلیمی
کو پەیدا ئەبی لە شــەخسی ئوومیی

خصوص چوار دەورەی هەموو وەحشەت بوو
دوور لە هــەر عیلمو مەدەنیەت بوو

ئـەم گوڵە جوانە لە ئــەم دڕکانـە
پەیدا بوونی بەس ئەمـری یەزدانــە

ئـەم تـەرەقی‌یە لـە گـەڵ فەقـیری
لە ناو ئەو هــەموو دوژمنی تـیری

چۆن دەکـرا ئەگەر ئەمری خوا نە با
تەنها ئەم هـەمـوو کوفرە لا ببـــا

دەرحەق بـەم شاهە کورتە زوبانمان
ناگاتـە حەددی وەسفوو بەیانمان

هـەر وەسفێ بیکەین زیاتر عالی‌یە
هــەر ئەمەندەیە کــە خودا نیــە

هەر وەسفێکی باش لە بەشەر هەبی
هەمووی مەجموعن لـە زاتی نەبی

نەبی چ نەبی ئەحمــەدی مورســەل
موژدەی هەر رەسول لە قرونی ئەوەل

خەتمی نەبووەت بـــەم زاتە کـــرا
چون تەمامی دین بـــەو بوو ئاشکرا

لە شاری مەککە ساڵی ( عام الفیــل )
تولــدی بـو محمـــد جلیـــل(١)

مەککە فەخرە کا لە سەر هەر مەکان
لە بەر لێ بونی سەیبیدی عەدنان
لە مەککە را یبوارد بەهەر نەوعە حاڵ
تا عومری بووە پەنجاوو سێ ساڵ
جا ئەمری خودا لە سەری کرا
لە بۆ مەدینە کە هیجرەت بکا
جا هیجرەتی کرد ئەمما چ هیجرەت
ڕۆژ بوو هاتە دەر لە شەوی زولمەت
شۆقی دا دنیا هەمووی رووناك کرد
تاریکە شەوی کوفری هیلاك کرد
( بشیر ونذیر ) بە شیرو زوبان
گاهێ بە نەرمی گاه شیری بورران
مەشغولی ئیعلای کەلامی حەق بوو
دونیای نە دەو یست هەر خوای مەرەق بوو

(١) عام الفیل ئەم ساڵەیە کە ئەبرەهە لەشکری هینا بو کە کەعبە تیك بدا خوای تعالی (طیر أبابیل) ی ناردنە سەرێ هەموویان بە هیلاك دان • بزانن خوا ئەم خوایەیە کە ئەم لەشکرە گەورەیەی بەوتەیرە زەعیفە لە ناو بەرد ساڵی عام الفیل بووبو بە تاریخ (مێژوو) تا وەکو تەئریخی کۆچێ داندرا لە لایەن ئیمامی عومەرەوە •

وتەمر

ئەصحابی پاکیش روحـم ڤیدایان
لە ژێر ئەمری بوون بە روحوو بە گیان

بە ماڵو منـــداڵ بە روحــو بـــەدەن
خزمەتکاری بوون ئەم روح ئەو بەدەن

باب و برایان لـــە شـــەوقی دینی
شەقو پـەق ئەکـــرد تائیمان بینی

بیستو پێنج غەزاو شەڕ لە گەل کوففار
بە خۆی لە گەل بوو ئەو زاتی نازدار

لەم بیستو پێنجە لە حەفت غەزایان
**بە خۆی شەڕ یەکرد سەییدی عەدنان**

لە بەدرو ئوحد لە شەری خـــەندەق
بـــەنی قبـــورەیزەو بەنی موستەلیق

لە شەری خەیبەر لە حـــەربی طائف
لە غەیری خـــودا قەت نەبوو خائف

دەساڵی ڕابارد بـــەم شـــەڕو شۆڕە
لە ناو مەدینە بـــە ئـــەم دەســتورە

تادینی پاکی تـــەواو بڵاو کــرد
کۆمەڵی کوفری پەرتو بڵاو کـــرد

ئەساسی دینی تـــەمام قایم کـــرد
عەزمی ویصالی خودای دائیم کـــرد

جا ئەمری حـــەق هات لە بۆ وەفاتی
( أنــا لله المــــــوت آتــى )

وەفاتی فەرموو جەنابی رەســول
( عليــه الصـــلاة بعد الرمول )

شێستو سێ سال بوو عومرەکەی پاکی
بێ ژمار بی سەلات سەر رووحی پاکی

دنیـــا تاریـك بو لەبەر مـردنی
جبریل قەطع بو ئـــەو جا هاتنی

قورئان تەواو بو وەحی قەطع بوو
نبووەت پاش ئەو خەتموو مـەنع بوو

هیچمان بۆ نەما غـەیری ئیتیبـــاع
خـــوا نەمان خاتـە رێگەی ئیبتداع

ریشی هـەر رەش بو تەغیر نـەبو بو
غەیری نۆزدەمــوو سپی نـە بو بو

لە پاش وەفاتی صدیقی ئەکبـــەر
بوە خەلیفە لە جێی پێغـــەمبــــەر

عومـــەری فاروق پاشی بوبەکـر
خەلیفـــەی دووەم زاتی بەزەفـەر

سێیەم خەلیفە حەزرەتی عوسـمان
چارەم عەلی بوو ( عليهم رضــوان )

رضوانی خودا له سەر هەموان بێ
هەم ئالو ئەسحاب چی مو سلمان بێ
له سەر ئێمەش بی له گــەل ئەمانە
گوناه عەفوو کە هەر چی هــەمانــە

## ( باسی روکنی پێنجەم باوەڕ بە قیامەت )

ڕوکنی پێنجەمین لە ڕوکنی ئیمـــان
باوەڕ بە قیامەت بە هەشتو نـیران
قیامــەت یانی زینــدی بوونەوە
بۆ جەشـــرو حیساب جەمع بوونەوە
ماوەیی دنیــای کە هات ئاخـــیر بوو
ئەمری تیك چوونی لای خوا سادر بوو
لە بۆ تێك دانی ئیسرافیل مەئمـــور
وەعدەی هات یوم ینفخ فی الصـــور
ئەمری دەکاتێ خـودایی قەهـــار
نەفخی سور بکە مەوێستە ئـەم جار
ئەمجا پف دەکا لە کێوو لـــە چیـــا
بەحرو بەڕ هەمووی دەکاتە تۆتیـــا
هەوای ئوکسجین هەمووی دەسوتێ
عالەم جێ بە جێ هـەمووی دەفەوتێ

هەرچی دەبینی لە ئەم نیزامە
هیچی نامینێ عومری تەمامە
تەرتیبی کۆن و ژیانی یەکەم
هەمووی تێك دەچی بە نەفخی یەکەم
چیا تیك ئەدا ( ینسف نسفاً )
هەمووی ئەکاتە ( قاعاً صفصفاً )(١)
هەتا موددەیێ وەها دەمینێ
بە غەیری خودا هیچ کەس نامینێ
جاری دووەمین کەپف دەکاتێ
بە ئەمری خودا کە فوو دەکاتێ(٢)

---

(١) ئەڕوانی بۆ ئەم ئایەتە( ویسألونك عن الجبال فقل ینسفها ربی نسفا فیذرها قاعا صفصفا لاتری فیها عوجا ولا أمتا ) سورة طه الایة ١٠٥ واتە پرسیارت لێ دەکەن ئەی محمد لە چیاو کیوەکان پێیان بفەرموو وردوو خاشیان ئەکا خودای من بە ورد کردنێکی وا کە خۆی دەیزانی پاشان وازیان لێ دینی دەبنە پانە دەشتێکی راست لە ناو ئەم دەشتە نابینی هیچ کەچ و کوچی و خواری •

(٢) ئەڕوانی بۆ ئەم ئایەتە(ثم نفخ فیە أخری فاذاهم قیام ینظرون ) سورة زمر الایة (٦٨) •

واتە دەفعەی دووەم پفی ئەکاتێ وە هەموو عالەم بەم پفە زیندوو دەبنەوە ڕائەوەستن بە سەر سامی تەماشای ئەمری خودا ئەکەن ئایا چ ئەمریان پێ ئەفەرمووی •

تەرتیباتـی نـوو ژیانـی دووەم
خـودای تعالی ئەداتـە عالـەم
هێزی ژیانـەوە ئەداتـە مـردوو
جا بە هێزی خـۆی ئەیکاتن زینـدوو
هەر کەس لە جێی خۆی قیام دەکاتن
ترسو لەرز ئەوان سەر سام دەکاتن
هەمووی بێ بەرگو پێ خواسو سەرکوت
رۆژیش لە سەریان نیزیکە یەك فووت
بێ شۆقو گەرمـە دنیـا تاریکـە
لەو رۆژێ هەر کەس بۆ خۆی خەریکە
هیچ کەسێ ئاگای لە هیچ کەس نیە
لە بـەر تەنگاوی نەفسـی نـەفسیە
ڕوناکی ئـەو ڕۆژ نـوری ئیمانـە
بێ ئیمان لەو رۆژ زۆر سـەر گەردانە
نازانـی ڕووی خـۆی لە کـام لا بکا
دەڵێتـە مۆئمین نـەختێ لا وەکـە
بەلکو شـۆقە کەت ئێمەش دابگـرێ
ئیمـان داو دەڵێ بۆ پـاشێ وەگـەڕێ
بڕۆوە دنیـا شـوقێ پەیا کـە

ئەگەر نا ئیمرۆ کارت هیلاکە(١)
چونەوە دنیاش بێ شەکە نا بێ
بەلام بۆ حەسرەت وا دەدا جوابی

جا خودای قەههار پەردەی زۆر بەتین
دێخیتە بەینی گاورو موئمین

ڕووی لای ئیمان دار هەمووی رەحمەتە
ڕووی لای گاوریش ئاگرو ئەزیەتە

ڕۆژی قیامەت بۆ مرۆی گاور
تاریکو ستانە هەمووی پڕ ئاگر

بۆ مرۆی موئمین بە نوێرەی ئیمان
مەحشەر ڕوناکە بێ کەمو نوقسان

---

(١) ئەروانێ بۆ ئەم ئایەتە( یوم یقول المنافقون والمنافقات للذين آمنوا أنظرونا نقتبس من نوركم قيل أرجعوا وراءكم فألتمسوا نورا فضرب بينهم بسور لەباب باطنه فيه الرحمة وظاهره من قبله العذاب سورة الحديد الاية (١٣) •

واتە لە ناو تاریکایی مەحشەر کە بۆ گاور تاریکە وە بۆ ئیمان دار ڕوناکە مونافیقەکان دەڵێنە ئیمانداران نەختێ لا وەکەن بەر وەلای ئێمە تا ئێمەش لە شۆقی ئێوە سوود وەر گرین وە بە نوری ئێوە پێش چاوی خۆمان ببینین پێیان دڵێن بگەڕێنەوە ئاشەوە نورێك پەیدا کەن بواتە بڕۆنەوە دنیا چونکە ئەوێ جێی نور پەیدا کردن بوو جا خودای تعالی پەردەیەکی ذاوێتە بەینیان لای ئیمان دارەکان رەحمەتە وەلای مونافیقەکان [illegible] ••

نـوری ئیمانـی هەنـدیّ وەك رۆژە
لە داخـی ئەوان گـاور دلسـۆژە

هەندیّ وەکو مانگ هەندیّ وەك لۆکس
وەکو چـرایە شۆقی هـەندیّ کەس

شۆقی بەعزێکیش بە قەد یەك مووە
چـونکە باوڕی زۆر زەعیـف بـووە

لە بـەر ئیزدحـام گـەرمایی رۆژیّ
بەدەن وەك کـانی عـەرەق دەرێـژیّ

مەیدانی مەحشـەر لە بـەر ئارەقـە
قـوڕو زیلەمۆ هەمـووی مەزلەقـە

هەر کەس بە گوێرەی کردەوەو ئەعمال
لە ناو قـوڕایە بـە حالو بیّ حال

هەندێك تا گوێزینگ لە ناو قوڕایە
هەنـدیّ تا گـوێچك هێزی بـڕایە

بەعزیّ هـەتا چۆك بەعـزیّ تا نـاوك
لێك تر نا پرسن نـە کـوڕ نە باوك

هەر کەس داخ داری دەر چونی خۆیتی
نەسەب بیّ سوودە هەر عەمەل خۆیتی

کوڕی پێغەمبەر هەر چەند لایق بـی
لـە ئەزیەتایە گـەر مونافیق بـی

کوڕی وەلیدی بـە زێدە حـەشمەت
لە گەل ئەحمەدە بـۆ چوونی جەننەت

هەر وەك لـە دنیا خـوراكی بـاوا
نەفعـی بۆ منـاڵ نابی تا نەیخـوا

یا باوك ئەگەر بە دەنـی ساغ بـی
بۆ مناڵی نە ساغ هیچ سوودی نابـی

ئیشی قیامەتیش عەینـەن وەهایـە
(فلا أنساب) فـەرموودەی خـوایە(١)

مەیدانی مەحشەر بۆ درێژیو كورتی
هەر كەس بە گوێرەی كردەوەی خۆیتی

بۆ زێدە چاكان بە قەد یەك سـەلات
حیسابی دەبـڕێ دەگاتـە جـەننات

بۆ زۆر خەرابان پەنجا هەزار سـاڵ
موددەی ریگایە سـەر سامو جەنجاڵ

ناوەنجی هەر كەس بە قـەد ئەعمالی
كـورتو درێژی حەشـرو سـوئالی

بەم حاڵە دەڕۆن هەتا جێی سـوئال
سوئالو جەواب بە گوێرەی ئەعمـال

---

(١) ئەڕوانی بۆ ئـەم ئایەتـە( فاذا نفخ فی الصور فلا أنساب بینهم یومئذ ولا یتساءلون ) المؤمنون آیـة ١٠١ واتە رهەر كات كە یـف لـە صور كرا لە لایەن ئیسرافیـل هیـچ نەسەبە نامینی لە بەینی ئادەمیزاد لەو رۆژی وە هەر وەها كەس پرسیار لە كەس نا كا كـە كـوڕی كـێی وە لەسەبەت جی‌یە •

دانەر

هەر جی کـردووتە لـە داری دنیـا
فلیـم گیرایـە وەکـو سینەما

بـۆت ڕا دەگیرێ بـە خـۆت دەبینی
زەڕە بـە زەڕە یـەك یەك دەخـوینی

بە میزانی حـەق دەت دەن لە قـەپان
سوکیو گرانی بـەم دەبـێ بەیـان

کردەوەی چاکـەت ئەگـەر زیاد بـی
بە نمرەی نەجـاح جا دلـت شـادبی

دەتبەن بۆ جێگەی خو شـەویستەکان
بە هـەشتی ناوە (جنـة الرضـوان)

هەر کەس بە گوێرەی چاکەو ئەعمالی
جێگە وەر دەگـری خـۆش دەبی حالی

هەر چی پێی خۆش بی یان کەیفی بینی
هەمووی حـازرە ئەزیـەت نا بینـی

بەدەن وەك شوشە مێشکی ناو ئێسك
بە چـاو دیـارە دەدا تریسـك

هەمووی لە شێوەی چـوار دە سـالی
ناسـكو جـوانن لە عەیب خـالی

لە بۆ جـوانی هـەر کەس یوسـفە
دەنگیـان وەك داوود بێ تەئەسووفە

ناو باغو باغـات ناو قەسـرو قسـور
ژیانی بێ غەم هەر کەس خاوەن حـور

لە ناو هەر باغێ لە بن هـەر دیـوار
جنـات تجـری تحتها الانهـار

لە هەر جێگادا چـوار ڕوبار جـارین
یەك ئاوە یەك شیر شەڕاب و هەنگوین

خۆشی ئـەم جێگە باسـی ناکـرێ
هـەر دەم لـە زەتە هەرگیز نا بـڕێ

ڕێگـەی ئـەم جێگە دینی ئیسـلامە
ئیتاعەی خـوداو خیـرا لانامـە

ئەگەر خرابـەت لە چاکـە زیاد بی
نمرەت دەشکینی هەم بەر بـاد ئەبی

زۆر بـە زەلیلی دەتبەن بـۆ ئاگر
دەبیە هـاو دەمی کۆمەڵـەی گـاور

دەرگەوانەکـان هـەموو پێت ئەڵێن
ئەی قەومـە گەلی هـەژارو غەمگین

کەس لـە دنیـادا نە بـو پێت بڵێ
ترسی ئەم جێگە روون کاو پێت بڵێ

ئیتاعەی خـوداو دینـی پێغەمبـەر
بە راسـتی بیکـەن تا نێنە سـەقەر

وەڵام وا ئـەدەن بـەڵێ زۆر هـاتن
گوێمان پێ نەدان هەر چەند کە هاتن

حیزی شەیتەنەت ڕێگـەی لێ گرتین
هاتاکـو تۆشی ئەو جێگەی کـردین

جا پێیـان دەڵێن مـادام کە وایـە
برۆنـە ژووریٚ هـەتا هـەتایە(١)

بچێـژن ئێشـی دۆزەخو زەقـوم
خۆراکتان زوخاو غەمناکو بەد شـوم

هـەتا هەتایێ لـەم جیگایە بـن
ئـازار ببینن بە گیانـو بـەدەن

نەتـان دەزانی دوژمنـە شـەیتان
ڕاتـان دە کێشی بۆ ئاگـرو نـیران

(١) ئەنواڕی بۆ ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە ( وسيق الذيـن كفـروا الى جهنم زمرا حتـى اذا جـاءوها فتحت أبوابها وقال لهم خزنتها الم يأتكم رسل منكـم يتلـون عليكـم آيـات ربكـم وينذرونكم لقاء يومكم هـذا قالو بلى ولكن حقت كلمة العذاب على الكافرين قيل ادخلوا ابواب جهنم خالدين فيهـا فبئس مثوى المتكبرين ) سورة الزمـر الاية ٧١ واته لێ دەخوێنێن ئەوانـەی گاورن بۆ دۆزەخ بـە کۆمـەل هـەتا دەگەنە جەھەننەم دەرگاکانی دۆزەخیان بۆ دەکەنەوە وە دەرگەوانەکان پێیان دەڵێن ئایا کەس لـە ناردراوەکـانو بەو فاریشەکانی خوا پێغەمبەرەکان یـا زانایەکان نەهاتنە لاتان ئایاتی خـواتان بۆ بخوێننەوە وە ئایەتتان فێر بکەن وە پێتان ترسێن لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە گاورەکان دەڵێن بەڵێ زۆر هاتن بەلام گوێمان پێ نە دان وە بە قسەمان نە کردن بە هۆی ئەم گـوێ نە دانـە جێبەجی بو وونەی عەزاب لە سەر گاورەکان ئەو جا لە لایـەن خـەزنە دارەکان پێیـــــان ئـەوتری مادام وەهایە بڕۆنە ژوورێ بۆ دۆزەخ بە دەرگەکاندا هەتا هەتایێ وبە ئەبەدی تێدا بمێننەوە وە زۆر ناخۆشە جێگەی ئەم کەسانەی کە لە بـەر خـۆ هـەل کێشان بەنـدەیان نە کـردووە بـۆ خلوەنی خۆیان کە خـوای گـەورەو تەوانایە •

بۆ گوێتان پێ دا ئـەی گەلی نـەزان
له کیس خۆتان دا بەهەشتی وا جـوان

بۆ بە گوێتان کرد ئەی گەلی بێ هۆش
له دەست خۆتان دا بەهەشتی وا خۆش

هەر کەس بە فام بی بەم عومرە کەمە
بەم عومری دنیا کە خـوا دایتیە مـە

جەهەننەم ناکڕی خـۆی مەنع دەکـا
لە فەخرو گوناه زۆر حـەزەر دە کا

کار بە فـەرمانی شەریعـەت دە کـا
خۆی دوور لە شەهوەی بەهیمی دە کا

فەرقی ئینسانان لە گەل حـەیوانان
هەر دینە مـەعلووم قەت مەبە نەزان

جا فەرقی ئینسان لە گەل بـــەهائم
هەر دینـــە مەعلووم قەت مەبە هائم

قانونی خـوایـە ئەم دینـــە جوانە
بۆ فەرقی بەشەر لە گـەل حـەیوانە

هەر کەس بێ دین بی لە خزمەت مەولا
لـــە کـــەر کەمتـــرە وەالله وبالله

بێ دینو گـــاور بزانـــە چییـــە
خـــودای گەورەمان دەری خستییە

به نەسی قورئان ( شـــر الدوابە )(١)
فـەرمایشی خـــوا ( أعـلا صوابە )

بۆیـــە لە قیامـــەت ئەزیەت دەبینی
حـــەیوان پاش مـردن ئیشی نامینی

ئـەهلی بەهەشتێ هـەمووی ئەبەدین
لـــە بەهەشتێ دا بـە خۆشی ئەژین

ئەهلی دۆزەخێ هەمـووی دوو بەشن
هەندێ ڕو رەشن   هەندێ سەر شورن

هەندێك موئمینن هـــەندەك ئافرن
مؤئمین مـوئـەقەت لە ناو ئاگـــرن

ئـەوی گافـــر بی ئەبەد ئەسـوتێ
بە ئەم سـوتانەش هەرگیز نا فەوتێ

چـــونکە لـــەوێ دا مـردن نا مینی
بـــە بێ کـــۆتایی ئازار دە بینی

(١) ئەنـواڕی بـۆ ئەم ئایەتـە ( أن شر الدواب عنداللّه الذین کفـروا فهم لایؤمنون ) سـورة الانفال الایة ٥٥

واتـە خەرابترینی هـەموو پـێ ڕۆیەك ئەو کەسانەن کـە کافـرن وە ئەوانە هیچ بیرو هۆشیان نییە ئەگـەر بیرو هۆشیان هەبوایە خودای خـۆیان لە بیر نەئەکرد ئەیان پەرست وە هەر وەها بێ ئەمریان نە ئەکرد وەئیمانیان دەهنا •

دانەر

ئەوی موئمین بی بە گوێرەی گوناە
دەسوتێ لە ژێر ئیرادەی ئیلاە
هەتا کو خودا رەحمی پێ ئەکا
یا شەفاعەت کار تکای بۆ ئەکا
هەر کەس لە ئاگر کە هاتە دەرێ
بە ئاوی حەیات لە شی ئەشۆرێ
لە پاشان دەڕوا ئەو جا بۆ بەهەشت
هەتا هەتایێ لە نازو نیعمەت
خوایە بە ڕەحمت خەلاتمان بکە
بێ چارەو غەریب ئازادە مان بکە
عومەر ببەخشە لە هەر خەتایێ
بشمان پارێزە لە هەر بەلایێ
لە ئیسمان تەواناى ئازاری نیە
پێجگە لە عەفووت کرداری نیە
بەکردار یەقین بۆ چونی بەهەشت
لیاقەتمان نیە هەر تۆو ڕەحمەت
لەم بەینە خۆتی غەفورو ڕەحیم
بۆ چوونێ بەهەشت نەجات لە حجیم
برژێنە سەلات لە سەر محمد
هەم ئالو ئەسحاب أبد الأبد

هەموو پێغەمبەر ئێمـــەش لە گەڵدا
دایكو بابمـان ڕۆلەش لـە گەلـدا

تلمیذو صۆفی مریدو مـــەحسـوب
هەر چی لە گەڵمان موحیب یا مەحبوب

هەزارو سێ ســەد هەفتاو چــوار
لە مێژوی كۆچی گـــەورەیی نازدار

ئەم نامـــە نوســرا كــرا بە كتێب
قبولی كا خـوا بەهەشت كا نسـیب

تا موسلمانان سوودی لێ وەگـــرن
بۆ ئەم لاو ئەولا مەڕەق دا نەگــرن

سوپاس لە بۆ تۆ ئەی شاهی شاهان
پشــــتو پەناهی گشت بێ پەناهان

لە بۆ تـەواو بون هێزت دا پێمــــان
بشـــمان پارێزە لە دەستی شەیتان

لە كاتی مــــردن ئاگـا دارن بــــە
نە یەتە پێشمان هیچ كەندو كۆسپە

تێبینی لە جاری یـــەكـەم دا كە ئـــەم كتێبە نووسرایەوە مەلا عبدالحمید نووسی‌یەوە وە ئەم چەند شیعرەی نووسین لە كۆتایی دا ٠

لـە ڕۆژی جومعــە تەواو بو نامــە
واسـیتەی نووسین رب الأنامـــە

بــــه دەستی موزنیب ناو عبدالحمید
خودا حیفظی کا لــه رۆژی وەعیـــد

ئەجری دانـــەری رەجا وەهایـــه
خـــودا بی نووسی بە بێ نیهـــایه

زین‌العابدین أستاذ شیخ عومـــەر
ئەسـل بالیسی نەســەب منـــەوەر

له بۆ دوعای چاك زۆر تکا ئەکـــەین
لەجەنابی شێخ تەشـــەکور ئـەکەین

## «بەرنامەیی چەوت وراست»

| لاپەرە | دێر | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ٤ | ٢١ | کرنۆشیات | کرنۆشیان |
| ٦ | ٩ | کوردوشان | کوردوستان |
| ٨ | ٣ | ئاودانە | ئاوەدانە |
| ١٢ | ١ | أعدولهم | أعدوا لهم |
| ١٢ | ١٠ | بترستین | بترسینن |
| ١٢ | ١٦ | مە س ل | مە سە ل |
| ١٧ | ٣ | رسوەل | رەسول |
| ١٧ | ١٥ | عەیری | غەیری |
| ٢٠ | ١٨ | چارتان | چاوتان |
| ٢١ | ٩ | ئەیی | ئەبی |
| ٢٢ | ١ | ئەشیکنێ | ئەشکێنێ |
| ٢٢ | ١٨ | پەحتندنایی | پەسندنایێ |
| ٢٢ | ١٩ | تەبوول | قەبوول |
| ٢٢ | ٢٠ | فەرابە | خەرابە |
| ٢٤ | ٤ | تەرتیت | تەرتیب |
| ٢٦ | ١٥ | پاشالی | پاشایی |
| ٢٦ | ٢٠ | ساغیە | نە ساغیە |
| ٢٧ | ١٢ | پەروەدی | پەروەردی |
| ٢٧ | ١٩ | تومانە | خۆمانە |
| ٣٧ | ١٦ | وەتۆقێ | دەتۆقێ |
| ٣٨ | ١٦ | ئەکەر | ئەگەر |
| ٣٩ | ١١ | دلعالین | العالمین |
| ٤١ | ١٤ | لسوتقی | لوتفی |

| لاپەرە | دێر | چەوت | راست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥٠ | ٢ | عەدر | عەدەد |
| ٥١ | ٢٣ | وینی | دینی |
| ٥٢ | ١١ | موخلوقە | مەخلوقە |
| ٥٤ | ١١ | ئەنوسنی | ئەنوسن |
| ٥٤ | ٢٣ | ولی | ویی |
| ٥٤ | ٢٤ | نیتی | کتێبێ |
| ٦٣ | ١٨ | «ان اللّه لایغیر مابقوم حتی یغیروا » الآله | « ومن اعرض عن ذکري فأولئك لهم معيشة ضنكا ونحشــــره يوم القيامة أعمى » |
| ٦٣ | ١٩ | چی‌یەجی • • • تاتاخیری | « زیادة » |
| ٦٤ | ٢٠ | وما ارسلناك | وما أرسلنا |
| ٦٤ | ٢١ | وەجیمان | وەحیمان |
| ٦٨ | ١١ | نو | ناو |
| ٦٩ | ٢٠ | بوویی | بێ |

